# موناجات

زۆری جوانی،بە زۆرە ملی
لە دەستمدا بە چل و فلی.
چما نەیکەم،لەسووچی زل؟
درۆزنی ، پەیمانی شل.
رەوەڕفێنی ، چاو بڕکێنە
شوورەیی بکە،مەیدرکێنە
بە شەو نوستن هەتاکوو رۆژ
بە رۆژ خافڵان و گێژ و لۆژ
ئەی خودای خۆم ، خوای هەموانی
سەد جار تۆبە وپەشیمانی.

گوورانم ، منداڵیم ، لاویم
پیاویم ، پیریم ،داکۆماویم
زانستم ، بیرم ، رامانم
دەرو ژوور ، ناحەز و جوانم
کچم ، کورم، زۆرم ، کەمم
شادیم ، خۆشیم ،خەم و تەمم
دەردم ، ساغیم ، ژین ومەرگم
نانم ، ئاوم، خانوو و بەرگم
مردنم ، زیندوو بوونەوەم
لێ خۆشبوونم ،سەرسوونەوەم
خودایە هەر لەتۆڕایە
دواکەوتنی لە خۆڕایە

هەرکەس وەک خەڵکی نەوسن بێ
بە خواردن و خەو وەک من بێ
ئاکاریشی با زۆر چا بێ
بەڕاستی پیاوی خودا بێ
هەر مامۆستایە وپیاوچاکە
لەوە پتر هیچ بۆ کەس ناکە
ئەی خوا تۆ بی وهەر چوارەکەت
بم خەیە شوێن راسپارەکەت
ئەی خودای خۆم خوای هەموانی
چاکی ، پاکی ،نووری ،جوانی

دیلم بە بەندی تاوانم
سووک و سەر کۆنەی هەموانم
رێوی بازی و سووڕاندنم
دین بە دنیا دۆڕاندنم
چەوت و هەڵەی زارو زمان
پێغەمبەری ئاخری زەمان
فرمێسکی روو زەردیم تکا
بە ئیزنی ویم بۆ بکەی تکا
پاداشی تۆش بدا خودا
بە خۆت و گەل دەستەی کەوا
ئەی خودای خۆم خوای هەموانی
لێ خۆشبووی سووچ وتاوانی

مل کەچ لە دەر راوەستاوم
بێ کەس ، بێ تێشوو ، داماوم
هۆی کردەی خۆمە شپرێوم
بە چاوی تەڕ زەردی لێوم
خودایە لێت خەجاڵەتم
بەزەییت بێ بە حاڵەتم
خاڵم سەری لێ سووڕماوە
چۆن سەردەرکا لەو گێژاوە
چارەم هەر تۆی مەولای قەدیم
استغفرالله العظیم

«خاڵەمین»

# ناوەرۆک



ئەم کتێبانەی خوارەوە بەمزووانە بڵاو دەبنەوە

قامووسی زمانی کوردی
نووسراوی :م.ا. زەبیحی

دیوانی مەحوی

دیوانی محەممەدی مەلاکەریم

خاطرات شیخ رئوف ضیایی

عومەر فارووقی
رێک وپێکی کردووە
ریاض الصالحین
وەرگێراوی :
ئەحمەد حەواری نەسەب

سروە گۆوارێکی فەرهەنگی ئەدەبی یە و مانگانە لە ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی دەردەچێ .


ارومیە: خیابان مدنی ـ سەراەخیام شمالی ـ انتشارات صلاح الدین ایوبی صندوق پستی ۷۱۷
تلفن ۳۵۸۰۰


چون خۆشەویستان ولایەنگرانی سروە لە دەروژووری وڵات بەنامەی جوان ورازاوە داوای "فۆرمی ئابوونمان"یان کردووە، ئەوە چۆنەتی ئابوونمان لە دەروژووری وڵات بەو شێوە رادەگەیەنین

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| نرخی | ۱۲ | ژمارە بۆنێو خۆی وڵات | ۲۰۰ | تمەن |
| نرخی | ۱۲ | ژمارە بۆ وڵاتە دراوسێکان | ۳۸۰ | تمەن |
| نرخی | ۱۲ | ژمارە بۆ هیند وئوروپا | ۴۴۰ | تمەن |
| نرخی | ۱۲ | ژمارە بۆئامریکا وخاوەری دوور | ۵۰۰ | تمەن |

ناونیشان : ارومیە ـ صندوق پستی ۷۱۷ ـ انتشارات صلاح الدین ایوبی ـ تلفن ۳۵۸۰۰

بۆ ئەم خوێندکارانە کە لە زانستگاکانی دەرەوە دەخوێنن ( ئەگەر بەڵگەی خوێندکاری خۆیان بنێرن ) هەوڵ و مەرجێک پێک دێنن کە گۆواری سروەیان بەنیوە قیمەت بۆ بکا .

# بەناوی خوا

وێرای سڵاو :

لەگەڵ بڵاوبوونەوەی سروە ی، جۆزەردان زۆر بەجێیە بە پێی هەل و مەرجی زەمان لەگەڵ ئێوە بدوێین و بە هاودڵی و هاوفکری یەکدی بۆ گەیشتن بە ئامانجی بە کەلک ، هەنگاوی پێویست هەڵێنینەوە .

جارێ با لە باسێکی ئەساسی وبنەڕەتی را دەست پێ بکەین . ئێستا زانست و سەرنج دان بە زانست مەبەستێکی گرینگ و حەیاتی یە . رەنگ بوو بەرە بەری کرانەوەی فێرگە و زانستگەکان ئەمباسەمان هێنابا گۆڕێ . بەڵام چون خۆگنخاندن لەم چەشنە مەبەستانە سەڵاح نیە و تا زوو چاری بکرێ درەنگە ، لێرەدا باسی لێدەکەین تاکوو لە فەسڵی وچانی هاویندا یانی بەر لەوە خافڵان بە یەکجاری ببێتە بنەمای باژێری ژیانی پڕ هەست وخرۆشی توێژی بەکاری کۆمەڵ، تەگبیر و رایەکی بنەڕەتی بەیەکەوە بکەین تا مرخ وئیستعدادی بەرزی ئازیزانی خوێندکار بەو پەڕی باشی کەلکی لێ وەربگیرێ و لە بەتڵانی ئەم هێزە گەورە بەرگری بکرێ .

بەراستی جێی خۆیەتی دامەزراندنی ئەو باسە سەرەتای باسێکی هەراو و بەربڵاوی ئەوتۆ بێ کەهەموو خاوەنڕایانی دڵسوز و بەزە ، بەچەشنێکی هەمە لایەنە شی بکەنەوەوبەشوێن بڵاوبوونەوەی ئەم زنجیرە وتارانەدا شاهیدی هەڵوێستی بەجێ وکارسازی. زانایان و خاوەنڕایان بین بەڵکوو بە رێنوێنی ودانی پێشنیار وگەڵاڵەی زانستی رێگەی گەیشتن بە ئامانج کورتتر بکەینەوە .

ئەگەر قەراروابێ وەکی هەموو دەبێ،ئینسان بین ، ئینسانیش بمێنینەوە و بۆ گەیشتن بەئامانجە پیرۆزە- کانی کۆمەڵی بەشەر حەول بدەین ، پێویستیمان بەدوو شتی ئەساسی و بنەڕەتی هەیە . ئەم پێویستی یە هەتا هەتایی یەوبەردەوام نیازمان پێ هەیە ونیازێکە هەست پێکردنی نیشانەی تەیاری وبێداری وتێکۆشانە بۆ رزگاربوون وبەختەوەری. بەڵام هەست پێ نەکردنی نیشانەی تەوەزەلی و لەنێو

---

فۆڕمی ئابوونمان

شمارە

ناو...............شۆرەت...............دانیشتووی........................

...... تمەنم بەحیسابی ژمارە ۵۴۰۰ ی شوعبەی ناوەندی بانکی سپەی ورمێ گرت و فیشەکەم وێرای ئەم بەرگە بۆ نارد ن . لەژمارە.........را هەتا.......گۆواری سروەم. بۆ بەرێ بکەن .

ناونیشان.........................................................

..............................................................................

چوون وگەڕانەوە بەرەوپاش و چارەڕەشی یە . ئەم دوو کەرستەن کە یەکیان بۆ زاڵ بوون بەسەر جیهانی دەروون وئەویدی بۆ زاڵ بوون بەسەر جیهانی ڕواڵەتی دا پێویستە .

بەڵێ ئەم دوو عونسورە زانست و ئیمانن . بێ ئیمان لەخرۆشی شێواوی پڕ شەپۆلی وجوودی خۆیدا سەرگەردان ودەستەوەستانە و بوونەوەرێکی بێ پێناسەو قەت ناگاتە بەستێنی رزگاری .

ئی وا ،وا لەنێو خەیاڵ و بیری پڕوپووچدا نوقم بووە کە قەت ڕێ دەرنابا. ئاخر کەسێک ئەتوانی هەبوونی خۆی بە جوانی تاریف بکا، لەکوێ فەلسەفەی "بوون" و "کران" دەناسێ ؟ چۆن دەکرێ چاوەڕوانی ئەوەتلێی بێ کە بۆ داڕشتنی پایەوبناغەی ژیان ئەو ژیانەی کە زوڵم و تێرۆهاتن و فەرق وجودایی تێدا نەبێ، هەنگاوێک هەڵێنێتەوە .

ئەگەر ئەمانە بەدەکار کردنی عیلم وزانست بە درێژایی مێژووتوانیبێتیان سووچێکی جیهانی دەروونی خۆیان لە چوارچێوەی زاراوەی فەلسەفی و موعادەلەی ڕواڵەتی و زەینیدا مانا لێدەنەوە ( ئەگەر ئەم مانالێدانەوە وبۆچوونەشیان راست بێ ! ) قەت هانەودنەی پێویستیان نابێ . ئەمانە کۆسپێکی گەورەتریان لەپێشە ئەویش لاڕێی بوون وسەرلێشێواوی یە راست ودروست وپڕبەختەوەری ئادەمیزادە .

بۆیە هەمووحەول ودەولی خاوەنڕای مادی لە دوو سەدەی دواییدا سەرەڕای کەلک وەرگرتن لە فەن و زانستی پێشکەوتووی نوێ لە ڕێبازی ئینسانەتی و بنەگرکردنی سولح و سەفا و قەلاچۆکردنی کوێرەوەری و هەژاری ودەستەکورتی و جیاوازی"نابەجێ"پلەی ژیاندا بێ ئاکام ماوەتەوەو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ شاهیدی خراتربوونی بارودۆخی جیهانین و هیچ هیوا و هومێدێکیش نیە کە ئەوبارو دۆخە لەداهاتوودا چاکتر بێ .

ئەم باسە بۆ بێ عیلم و زانستەکانیش بەشێوەیەکی دیکە دێتە گۆڕێ . گوتمان زانست کەرستەیەکە بۆ زاڵ بوون بەسەر جیهانی ڕواڵەتیدا ، هەرچی لێی بێ بەش بێ لە کەلک وەرگرتن لەپێزوبەرەکەتی جیهان بۆ گەیشتن بەکەماڵ بێ بەهرەیە . ئەوەی لەدنیا زانست و مەعریفەتی نەبێ کوێرە . کوێریش لە دیتنی زۆر شوێنەوار بێ بەش ولە لێکدانەوەی زۆر ڕوودا و عاجزە . ئەوەی زانست و مەعریفەتی نیە یا لە سەرەڕۆیی و تاریکان دایە یا هەموو دەم مەترسی سەرەڕۆیی و تاریکانی لێدەکرێ .

عیلم وزانست لەجیهانی دەروونیشدا دەورێکی بەر چاوی هەیە . چون ئیمانێکی پێوەندی نزیک و قووڵی لەگەڵ زانست و مەعریفەت هەبێ بەرز وقایمە ولەشکان نایە . یانی هەرچی بیر و بڕوای ئینسان مەعریفەتێکی بەهێزتری تێدا بەدی بکرێ ئیمان بەم بیرو بڕوایە پتەوتر وبەهێزتر دەبێ.

بنۆسی سەرەکی بوونی خوڕافات لەزەیندا ،نەزانی و نەخوێندەواری یە .

عیلم و زانست وەک مەشخەڵێک کون و کاژێری تاریک ڕووناک دەکاوجوانی و دزێوی لێک هەڵدەوێرێ کاتێک شکی عیلم ومەعریفەت ببڕێ مەیدان بۆ هێرش و پەلاماری دەغەڵان دەکر - ێتەوە کە لە ساکاری و ساویلکەبوونی خەڵک بە خراپ کەلک وەردەگرن وبیری هەڵەی خۆدۆراندن و لەخۆ نامۆبوون لەواندا پێک دێنن .

روانینێک بەسەر مێژووی سیاسی، کۆمەڵایەتی،ئابووری

و فەرهەنگی گەل و نەتەوە جۆراوجۆرەکاندا ئەم راستی یە دەسەلمێنێ کە کاتێک نەتەوەیەک ئیمان و عیلمی وێکرا بوو و قەدری زانی دەگاتە ترۆپکی پێشکەوتن و کەمال. بەلام سەلا لەو نەتەوە کە لە فەراموشی و غەفلەتدایە و رۆژی رەشی ئەو کەلک وەرنەگرتن لەمدوو کەرستەی ئەساسی شارستانەتی یە.

سەدەی نێوەراست کە ( دەورانی دەسەلاتداری کلیسا و بە دەغەلی بە ئیمانەوەلکان و تەریک بوون لە عیلم و زانست و مەعریفەت بوو) و سەدەی حازریشکە ( دەورانی دووری ومەوداگرتنی ئینسانەکان لە ئیمان و بایەخە بەرزەکانی مەعنەوی وروحانی و حاکمەتی پاوان خوازانەی عیلموتێکنۆلۆژی یە ) ئەزموونێکی تالی سەرنج دان بە لایەنێکی دوو عونسوری زانست وئیمانن.

لەوبارەدا قسە زۆرە و دەرفەت کەمە. ئێمەش مەبەستمان لەو باسە چوونە نێو باسێکی تەحقیقی و هەموو لایەنە نەبوو، بەلکوو دەمانەوێ بەم سەرەتایە ( هەروەک پێشوو گوتمان) باسی پێویستی یەکانی کۆمەلی خۆمان بکەین. خوا یاربێ و تۆفیقمان بدا لە ژمارەکانی داهاتوودا بە ناوی " عیلم و زانستی کوردستان سەرنجێکی پتری دەوێ دریژەبەو باسە دەدەین

## بسمه تعالی سرمقاله

ضمن سلام

اکنون که نشریهٔ خردادی سروه تقدیم شما دوستان شده است ضروری بنظر میرسد که بتناسب شرایط زمانی، سخنانی را با شما درمیان گذاشته، تا باهمدلی وهمفکری یکدیگر برای دستیابی به نتایجی سودمند وموثر، گامهای لازم برداشته شود. یکی از این سخنان، موضوع اساسی دانش و لزوم توجه هرچه بیشتر به این امر مهم وحیاتی است شاید مناسبتر بود که درفصل بازگشایی مدارس ودانشگاهها به این بحث می‌پرداختیم اما ازآنجاکه تاءخیر در طرح اینگونه بحثها مصلحت نبوده ودرنگ درآن جایز نیست دراین فرصت آنرا مطرح میکنیم تا شاید درآستانهٔ آغاز فصل تعطیلات وقبل ازآنکه غفلتهای معمول بیکباره معرکه گردان بازار زندگی محرک ترین و پرجوش ترین قشر اجتماع گردد بااتخاذ تدابیری اصولی، استعداد عظیم عزیزان دانش آموز ودانشجو بنحو مطلوب استفاده واز هرزرفتن این نیروی بزرگ ممانعت بعمل آورده شود.

فی الواقع این بحث مدخل وتبصیری دیگر ویا مقدمه‌ای بریک مبحث گسترده ومفصل است که باید ازسوی همهٔ صاحبنظران دلسوز وهمدرد وبطورهمه جانبه تبیین وتشریح گردد واین انتظار میرود که در پی انتشار این سلسله بحث، شاهد عکس العملهای مثبت، سازنده وکارساز صاحبان علم وفضیلت باشیم، تا باارائه طریق پیشنهادات وطرحهای عملی هدف را سهل الوصول ترسازند اگر قرارباشد همانگونه که وظیفه داریم انسان باشیم، انسان بمانیم وبرای تحقیق اهدافی که برای یک جامعهٔ انسانی متصور است تلاش کنیم بدو عنصر اساسی وبنیانی نیازمندیم. نیازی که درهیچ حال ووضعی برطرف نخواهدشد نیازی که احساس آن دلیل بیداری وآمادگی برای فلاح و ونیکبختی وعدم احساس آن دلیل قهقرا، سستی، انحطاط، مردگی وشقاوت است این دوعنصر دو ابزارند که یکی برای تسخیر جهان درون ودیگری برای تسخیر جهان بیرون لازم است، آری این دوعنصر همان علم وایمان هستند.

فاقد ایمان درتلاطم دریای وجودش متحیر وسرگردان وغریقی

بی هویت است وهرگز به ساحل نجات وروشنی وفهم حقایق برین زندگی نخواهد رسید. چنین کس آنچنان در اوهام واندیشه‌های واهی گرفتار است که هرگز راه بجایی نخواهد برد. وراستی، آنکس که در ارائه تعریف درستی از وجود خویش ناتوان است کجا فلسفهء "بودن" و "شدن" را درک تواند کرد؟ وچگونه از او انتظار میرود که برای بنای شالودهء یک زندگی انسانی که در آن از ستم، تجاوز، تبعیض وتحمیق همنوعان آثاری نباشد، ازخود حرکتی نشان دهد؟ اینان اگر با بهره‌گیری از علم ودانش و درطول قرون واعصار توانسته باشند زوایای کوچکی ازجهان درونشان را درقالبی ازعبارات فلسفی ویا معادلات ذهنی وصوری معنی کنند (اگر این معنی بطور فرضی صحیح هم باشد) هرگز انگیزه وشوق لازم واکید را بدست نمی‌آورند وتازه مشکلی بزرگتر درپیش روی دارند و آن یافتن جهتی صحیح ومتضمن سعادت آدمی است. درست بهمین خاطر است که تمامی تلاشهای صاحبنظران مادی در دوقرن اخیر علیرغم برخورداری از فنون وعلوم مدرن وپیچیده درراه اعتلای انسانیت وبرقرا -ری صلح وصفا ومحو آثار رنج، فقروتنگدستی وتفاوتهای فاحش ونامعقول درسطح زندگی بی نتیجه مانده است وروزبروز شاهد افزایش وخامت اوضاع جهان وکاهش امکان بهبود آن هستیم. این بحث برای فاقد علم ودانش نیز هرچندبگونه‌ای دیگر مطرح است. گفتیم که علم ابزار تسخیرجهان بیرون است که چون از آن بی بهره باشی دراستفاده ازامکانات جهان آفرینش (درنیل به کمال) بی نصیب فانی - انسان فاقد علم ومعرفت درجهان چون کوری است که ازمشاهدهء بسیاری ازآثار محروم واز تحلیل بسیاری وقایع عاجز است. آنکه وی راازدانش و، بینش بهره‌ای نیست یا درانحراف وضلالت است ویا همواره این خطر بالحظه لحظه‌های زندگیش قرین است. علم ومعرفت حتی درتسخیر جهان درون نیز نقش قابل توجهی ایفا میکند. قطعاً " ایمانی محکم وتزلزل ناپذیر است که رابطه‌ای نزدیک وعمیق باعلم وآگاهی داشته باشد و بتعبیر دیگر هرچه معتقدات انسان مبنای معرفتی قویتری داشته باشد، ایمان به آن معتقدات خلل ناپذیرتر. میگردد. علت اصلی وجود خرافات راباطل دراذهان، جهل وبی سوادی است. علم ومعرفت چون مشعلی فروزان زوایای تاریک ومبهم راروشن میکند و زشتی وزیبایی راازهم باز می شناساند. وقتی پای علم و معرفت کنار کشیده شود میدان برای تاخت وتاز فریبکاران حیله‌گری بازمیشود که ازصفا وسادگی افرادسوءاستفاده کرده وباالقاء اندیشه‌های انحرافی زمینه‌های خود باختگی وازخود بیگانگی رادرآنان فراهم میسازند. بررسی تاریخ سیاسی اجتماعی - اقتصادی وفرهنگی اقوام وملتها موءید این حقیقت است که هرگاه قومی به دوعنصر ایمان وعلم بطورتوءام ارزش لازم رابخشید به اوج ترقی وکمال رسید وبرعکس دوران سیاه ملتها همان دوران فراموشی وغفلت ازهریک از این دوعامل اساسی تمدن است. قرون وسطی (دوران حاکمیت کلیسا وتکیه مزورانه برایمان وطرد علم ودانش ومعرفت) وقرن حاضر (بعنوان دوران دوری وفاصلهء انسانها از ایمان وارزش های والای معنوی وروحانی وحاکمیت مطلق وانحصاری علم وتکنولوژی) تجربه‌ای سیاه ازتوجه یک بصری وانحصاری به علم یا ایمان بود سخن دراین باره بسیار است ومجال کم ومانیز قصد ورود به یک بحث تحقیقی وهمه جانبه دراین باره رانداشتیم وماراقصد براینست که با استعانت ازاین مقدمه چنانکه از پیش ذکر شد، به ضروریات جامعهء خودبپردازیم انشاءا... گر توفیق همراهی کند در شماره‌های آتی تحت عنوان، "کردستان وضرورت توجه هرچه بیشتر به علم ودانش" بحث خودرا پی خواهیم گرفت.

خدا نگهدارتان باد

# رۆژوو

## مامۆستا مەلا خدر عەبدوللاهیان

" کورتە باسێک لەسەر رۆژوو"

**الحمدلله الذی فرض علینا الصیام کما فرض علی الذین من قبلنا** مانای رۆژوو (لەووشەدا ) یانی دووری لەشتێک ، ولەباری شەرعەوە ،یانی دووری لەهەموو خواردن وخواردنەوەیەک دەرۆژێدا .

رۆژوو گرتن لەمانگی رەمەزاند **فەرزی عەینە** .لەرۆژی دەهەمی مانگی شەعبانی سالی دووهەمی کۆچی یەوە واجبکراوە .

دەلیلی فەرز بوونی رۆژوو ،سێن:

یەکەم- فەرمایشی خودا : **یاایها الذین آمنواکتب علیکم الصیام....** ئەی کەسانێکی ئیمانوو بەخودا وپێغەمبەران ومەلایکەورۆژی قیامەت هێناوە ، رۆژوولەسەر ئێوە فەرز کراوە .

دووەم- سوننەت : قەولی حەزرەتی رەسوولی ئەکرەم ( د- خ) **بنی الا سلام علی خمس: شهادتان لااله الاالله وان محمداً" رسول الله واقام الصلاه، وایتاء الزکاه، والحج وصوم رمضان** یانی بناغەی ئیسلام لەسەر پێنج شتانە :

**۱- دەبێ ئینسانی موسولمان شاهیدی بدا کە بێجگە لەخودا هیچ مەعبوودی دیکە نیە و شاهیدی بدا کەحەزرەتی محمد قاسیدی خودایە .**

**۲- نوێژ بکا .**

۳- زەکات بدا .ئەگەر زەکاتی لێکەوتبێ.

۴- چوون بۆ حەج ،ئەگەر توانای مالی هەبێ

۵- رۆژووگرتن لەمانگی رەمەزاندا

سێهەم- **ئیجماع**:یانی تەواوی ئوممەتی حەزرەتی محەممەد ( د- خ) هاودەنگن لەسەر فەرزبوونی رۆژووی مانگی رەمەزان، و هیچکامیان لەوبارەوە نەزەری جیاوازیان نیە . وئەگەر کەسێک رۆژووی مانگی رەمەزان ئینکار بکا ، کافرە . لەبەر ئەوەی کە **:کتێب ، وسوننەت ،و ئیجماع**، یانی هەرسێکیان ئینکار کردوە .

کەوابوو موسولمان کەسێکەکەباوەڕی بەو

پێنج فەڕزە هەبێ. ئێستاش لەبارەی سبووتی مانگی ڕەمەزان دەدوێین:

حەزرەتی محەممەد فەرموویەتی

**صوموا الروئیته وافطرو الروئیته فان غم علیکم فاکملوا عده شعبان ثلاثینی ، رواه البخاری عن ابی هریره:**

یانی ئەگەر هەوا ساف بوو بەدیتنی مانگی نوێ لەلایان ئینسانی موسوڵمان وعاقڵ وعەزەب وئازاد وعادڵ ڕۆژووی بگرە. بەڵام ئەگەر هەوا سافنەبێ یا مانعێکی لەپێش بێ دەبێ سی ڕۆژەی مانگی شەعبان تەواوبێ پاشان ڕۆژووی بگری.

ئیمام شافیعی فەرموویەتی:

**یثبت شهررمضان باحد امرین الاول روءیه هلاله. اذاکانت السماء خالیته مما یمنع الرویه من غیم اودخان اوغبار او لخوها الثانی الکمال شعبان ثلاثینی یوما" اذا لم تکن السما" خالیه مما ذکره. (مذاهب اربعه ۵۴۸)**

یانی مانگی ڕەمەزان بەیەکێک لەو دوو، ئەمرە سابیت دەبێ: دیتنی مانگی نوێ، یا تەواو بوونی سی ڕۆژەی مانگی شعبان"

**اذا سئل عن ثبوت رویه الهلال بقطر من الاقطار هل وجب الصوم علی سائر الاقطار اجیب به قول الشافعیه اذا رویه الهلال فی جهه وجب علی اهل الجهه القریبه منها من کل ناحیه ان یصوموا بناء علی هذا لثبوت والقرب یحصل باتحاد المطلع بان یکون بینهما اقل من اربعه وعشرین فرسخا " تعدیدا " اما اهل الجهه البعیده فلایجب علیهم الصوم بهذه الرویه لاخیلاف المطلع.** ( مذاهب اربعه ل ۵۵۰)

یانی وەختێک بەهۆی ئینسانێکی موسوڵمان وعاقڵ وعەزەب وئازاد لەجێگایەک مانگی یەک شەوە دیترا، لەسەر خەڵکی تەواوی جێگاکانی تر کەمەودایان لەوجێگایەی مانگی لێ دیتراوە ۲۴ فرسەخ کەمتربێ ( ۱۹۲ کیلۆ میتر) ڕۆژوو واجبە. بەڵام ئەگەر فاسیلەی

بەینی ئەوناحیەی کەمانگی لێ دیتراوە وئەو ناحیەی مانگی لێ نەدیتراوە، ٢۴ فەرسەخ، یا زۆرتربێ، بەو مەرجەکە ناحیەیەکی مانگی لێ دیتراوە کەوتبێتە لای خۆرئاوا، حوکمی رۆژوو لەسەر خەڵکی ناحیەیەکی کەوتبێتە لای خۆرهەڵات بەفاسیلەی زیاتر لە (١٩٢) کیلۆمیتر واجب نیە. چونکوو؟( **ئیختیلافی مەتالیع** )لە بەین دایە.

بەڵام بەپێچەوانە، ئەگەر هیلال لەناحیەی خۆرهەڵات دیترا بێ، حوکمی رۆژوو لەسەر، دانیشتوانی ناحیەی خۆرئاوا واجب دەبێ.

چون لەبارەی چۆنیەتی سبوتی هیلالمان باس کرد، لازمە لەبارەی: فەلسەفەی رۆژووئەرکانی رۆژوو، ئەرکانی رۆژوو، هەل ومەرجی دروست بوونی رۆژوو، هەل ومەرجی واجب بوونی رۆژوو، وئەوانەی روژوویان پێ بەتاڵ دەبێ، باس بکەین.

بەموتالایەکی کەکردوومە بۆم روون بۆتەوە کەرۆژوو مانگی رەمەزان لەهەموو رۆژووکانی کە لەسەر قەومەکانی پێشوو فەرز کراوە گەورەترە. لەبەرئەوەی کە غایاتی مەعقوول لەرۆژووی مانگی رەمەزاندا مەنزوور کراوە، دووەم وەختی رۆژوو گرتن دیاری کراوە، لە گەڵ وەرزەکان دەگۆڕێ. وئینسان لەچۆنیەتی هەژار ودەستکورتەکان لەهەموو وەرزەکاندا ئاگادار دەبێ. رۆژوو هۆی پاک کردنەوەی، نەفسە ولابردنی پێوستی دەستکورتانە، و بارهێنانی خۆی باشی موسوڵمانان.

پێغەمبەردرودی خوای لەسەربێ فەرموویەتی:

**لالصائم فرحتان یفرحهما اذا افطرفرح واذا لقی ربەفرح بصومە**. یانی: بو ئینسانی رۆژووان بێجگەلە عیبادەت ورۆژووگرتن دوو خۆشحاڵی دیکە هەیە:

یەکیان ئەوەیە کەبۆ بەربانگ کردنەوە، تاڵوکەی دەکا. ئەوی دیش ئەوەیە کەلەرۆژی قیامەت بەحزوری خواشاد دەبێ. ئەودووخسڵەتە بۆئینسانی غەیری رۆژووان نیە.

لێرەدا دەبێ ئەرکانی رۆژوو بزانین:

هەوەڵ، نیەتی رۆژوو لەشەوێدا بۆهەر رۆژوێک، رۆژوی منداڵ ئەگەرچی لەسەری نیە بەڵام دروستە.

دووەم، دووری کردن لەخواردن وخواردنەوە وهەڵمژینی دەرمان بەلوتیدا.

ئەوانەی رۆژوویان پێ بەتاڵ دەبێ بەتێکڕایی نێویان دەبەین:

١- ئەوشتەی بەئانقەست پچێتە نێوزگ.

٢- ئیمالە کردن لەپێش یاپاش.

٣- رشانەوە بەئانقەست.

۴- جیماعی بەئانقەست لەفەرەج، بەڵام بە سەهو بەتاڵ نابێ.

۵- هاتنەدەری "مَنی" بەدەستی خۆی یا کەسێکی دیکە.

۶- حەیز.

٧- نیفاس.

٨- شێتی.

٩- کفر کردن.

هەل ومەرجی واجب بوونی رۆژوو چوارن:

١- ئیسلام

٢- عەزەب
٣- عاقڵ
٤- ئیتاقە، یانی توانایی ڕۆژووگرتن.
هەل ومەرجی دروست بوونی ڕۆژوو بەمجۆرەیە:
١- ئیسلام ٢- تەمیز ٣- پاک بوونەوەی ژن لەحەیز ونیفاس وزان ٤- وەختی ڕۆژووگرتن بێ. وڕۆژی دردۆنگی نەبێ.
ڕۆژوو لەسەر پیری بێ تاقەت ونەخۆشێکی چارەی نەکرێ واجب نیە. گێڕانەوەشی (قضا) لازەم نیە. بەڵام پیر ونەخۆش بۆ خواردنی

هەریەک لەڕۆژووەکانی دەبێ یەک (مد) ١٢٠ مسقال لەخواردەمەنی بەفەقیران بدا، وئەگەرتوانای ماڵی نەبێ واجبە ڕۆژووەکان بگرێتەوەوفیدیەی لەسەرنیە.
ڕۆژوو لەسەر ژنی حامیلە وژنێکی کەشیری دەدا بەمنداڵی، وترسی مردنی هەبێ واجب نیە. بەڵام ئەگەر ژنی حامیلە وئەوژنەی شیری دەدا لەخۆفی خۆی ڕۆژووی نەگرێ یا لەخۆفی خۆی ومنداڵەکە نەی گرتبێ قەزا واجبە، نەفیدیە وەئەگەر ئەودووانە تەنیا لەترسی هیلاک بوونی منداڵەکە ڕۆژوو نەگرن فیدیەو قەزایان لەسەر واجبە.
ڕۆژوو بۆشێت وبێهوش کە ئیختیاریان نەبێ واجب نیە، وقەزاشی لازم نیە. بەڵام ئەگەر بۆخۆی خۆی بێهوش بکا، قەزا واجبە.
ڕۆژوو لەسەر ژنێک کە لەحاڵی حەیز و نیفاس دا بێ واجبە، بەڵام گرتنی حەرامە، و دەبێ پاشان بی گرێتەوە.
ڕۆژوو لەسەر موسافیرێک کە ڕێگاکەی ١٢٨ کیلۆمیتر بێ وسەفەرەکەی مەباح بێ، ولەسەر نەخۆشێکی هیوای چاوبوونەوەی هەبێ واجب نیە بەڵام گرتنەوەی واجبە وفیدیەشی نیە.
ئەگەر ڕۆژووی ڕەمەزان بەجیماع بشکێندرێ بێجگەلەتەعزیری هەردووک، دەبێ ئەو. کەفارەیەش بدا:
١- ئازاد کردنی یەک عەبد.
٢- دوومانگ ڕۆژوو بەنیەتی کەفارە بەبێ بڕینەوە. وئەگەر نەتوانێ ڕۆژوکە بگرێ دەبێ تەعامی شێست فەقیران بدا. (بەهەریەک "مد")
بەڵام ئەگەر جیماعەکەی لەهەمان ڕۆژدا دووپا - ت بکاتەوە، کەفارەلاز م نیە دووپات بکرێتەوە.
ئەگەر پیاو چوار ژنی هەبێ ودەڕۆژێکدا بچێتەکن هەرچواران، تەنیا یەک کەفارەلازەمە.
سێ شت لەڕۆژوودا سونەتە:
١- پەلەکردن بۆ بەربانگ کردنەوە، بەم مەرجە کە خۆرئاوابوونی لێ یەقین بێ.
٢- هەستانەوە بۆ پارشێو لەئاخری شەوێدا پێغەمبەر درودی خوای لەسەربێ فەرموویەتی:
**"تسحروا فان فی السحور بی کە".**
یانی پارشێوێ بکەن،بۆ ئەوەی پارشێو کردن بەرەکەتی هەیە.
٣- دووری کردن لەقسەی خراپ، ئەگەر کەسێک جنێوی پێدان، لەجوابدا سێ جاران دەبێ بڵێی ئەمن بەڕۆژووم، تاکوولەخێری ڕۆژووکەت کەم نەبێتەوە.
**" والسلام علی من یخدم الحق لذات الحق"**

# باسی ئەدەبی

سەید قادر سیادەت

لەو کاتەوە بەشەر توانیویە هەستی دەروون و قسەی دڵی خۆی بە شێوەی قام و گۆرانی لە چوارچێوەی وشەدا بڵێ وویرەویر بکا شیعر پەیدا بووە. چونکە ئەو وشانەی قام وگۆرانی یان پێ گوتراوە شیعر بوون. بەڵام ئەو سەردەمە نەیانزانیوە ناوی لێ بنێن.

مەبەستلەم باسە وەبەرچاوخستنی شێوە جۆربەجۆرەکانی شیعرە لە سەبکەکانی ئەدەبیدا نەک نواندنی لقی ئەدەبی و هونەری لەو سەبکانەدا. وەکوو شێوەکانی نەسر و نەققاشی و مۆسیقا و میعماری و... بۆیە بە پێویستی دەزانم لە هەوەڵەوە بە گشتی و بەکورتی بە گوێرەی ئەمتاریفانەی لە مێژووی ئەدەبیدا لە سەبک کراوە دەست ـ نیشان بکەم تا باشتر بتوانم شیعری ئەم سەبکانە بناسێنم.

**سەبکی رۆمانتیک**

ئەم وشەبە مانای خەیاڵ وخەیاڵپەروەری هاتووە

لەم سەبکەدا شاعیر زۆرتر لە خەیاڵ و هەستو بیر و زەینی خۆی کەلک وەردەگرێ ، ئازادی بەیانی هەیە و لەو بابەتانە کە رێ ورەسم و ئاکاری کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی پێ دەگوترێ خۆ دەبوێرێ و بە لاسایی قارەمانانی رابردوو، مەینەتو دەردی خۆی و کۆمەڵەکەی دەردەبڕێ و لە بەسەرهات و رووداو و کارەساتی ناخۆش و دڵتەزێنی کۆمەڵ سۆژە وەردەگرێ . دەیکاتە شیعر و چیرۆک. **شاتۆبریان ، گۆتە ، مادامدوستاڵ واڵتر لەبەدی** هێنەرانی ئەم سەبکەن .

**سەبکی رئالیست**

رئالیستیانی وەدوای حەقیقەتکەوتن . دوور لە رێگادان بە خەیاڵ و هەست ، بۆ وەبەرچاوخستنی راستی یەکانی ژیان و ناسینی هۆیەکانی ئەوان ، کە لەپێک هاتنی شێوە جۆراوجۆرەکانی ژیان شوێنیان داناوە. ئەوانەی زیاتر وەدوو ئەم سەبکە کەوتوون، **بالزاک ، ماکسیم گۆرکی ، تۆلستۆی** و چەند زانا و ئەدیبی دیکەن .

**سەبکی کلاسیک**

بەپێی باس و تاریفێک کە لە مێژووی ئەدەبیدا لەم سەبکە کراوە،کلاسیک لە زاراوەی ئەدەبیدا روانینێکی تایبەتی بەرامبەر بە تەبیعەتو کۆمەڵ و ئەخلاقی کۆمەڵایەتی هەیە . یا بەگوتەیەکی دیکە بە ئەدەبیاتێک دەڵێن کە لە ئاسار و ئەدەبی یۆنان و رۆم تەقلید یا پێشوازی کرابێ. چونکە لەو سەردەمەدا کە کلیسای مەسیحی ـ

یەتتا سەدەی سێزدە دەستی بەسەر هەموو ئاسەواری ئابووری ، ئەدەبی ، سیاسی ، کۆمەڵایەتی وڵاتە مەسیحی یەکان داگرتبوو . بەعزێک لە ئەدیبە ئازا ونەترسەکان کەوتنە فیکری بووژاندنەوەی ئەدەبی کۆنی یۆنان و رۆم کە بەم جۆرە بوومەکتەبی **ئومانیسم** پێک هات . هێندێک لە شوێنەوار و دیاردەکانی ئەم سەبکە بەم جۆرەن :

١ـ شاعیری کلاسیک تەقلید لە تەبیعەت دەکا و جوانی یەکانی دەکاتە مەوزووع و مەبەستی شیعری خۆی .

٢ـ شاعیر وەدوای شاعیرەکانی پێشووتر دەکەوێ چونکوو پێی وایە شاعیرانی پێشوو هەست و بیری کۆمەڵی خۆیان ناسیوە . ئەمانیش دەیانەوێ بنوێنن کەهەست وبیری کۆمەڵی خۆیان دەناسن .

٣ـ ئەم لاسایی یە بەپێی عەقڵ ومەنتیق بووە نەک بەوەهم و خەیاڵ .

٤ـ ئەدەبی کلاسیک دەبێ فێربکا وتەنیا جوانی نەزم و شێوەی شیعریان بە کافی نەزانیوە .

٥ـ مەبەست لەم سەبکەدا دەبێ رۆشن بێ . دوور لە ئیلهام و خەیاڵ پەروەری .

٦ـ چەند دیاردەی دیکە کە بە تەواوی ئەم سەبکە لە سەبکەکانی دیکە جیادەکاتەوە

شیعر لەم سەبکەدا بە لەبەرچاوگرتنی هاسان بوون یا گران بوونی نێوەرۆکی شیعر و هەروەها لە روانگەی رێک وپێک کردنی وشەی شیعر و خوڵقاندنی سنعەتەکانی شیعری وەک **ئیستیعارە** ، **کنایە** و ... چەند شێوەی تایبەتی بە خووە دیوە. وەکوو غەزەل ، قەسیدە ، روباعی ، چوارینە ،موخەممەس و ... لە سەبکەکانی خۆراسانی ، هیندی عێراقی ، ئازەربایجانی خۆیان نواندووە .

هەر یەکە لەم جۆرە شیعرانە بۆجۆرێک مەتڵەب و مەبەستی شیعر کەلکی لێ وەردە ـ گیرێ و تا بڵێی کێش و قافیە لەم شێوانەدا مەیدان دارە .

شاعیر لە هەر چەشنە بابەتێک بدوێ دانامێنێ مەگەر دەستەڵاتی بەسەر کێش و قافیەدا نەبێ .

لەگەڵ ناسینی کێش و قافیە بەشێوەیەکی تەبیعی هەست بەوە کراوە کە وشەی شیعر و چۆنەتی لێکدانی وشەکان ولەبەرچاو گرتنی سنعەتی شیعری لە شیعردا پێداویستی بنەڕەتی یە و شاعیر ناتوانێ چاوی لێ بپۆشێ .

· چوارچێوەی شیعر لەگەڵ نێوەرۆکی شیعرە کە دەبێ رێک بکەوێ چونکە ناجۆری یەکیان دەبێتە هۆی لەکەلک کەوتنی ئەوی دیکەش . جا لە ئاکامدا یا شیعرە کە چەوت و هەڵە دەبێ یا لە هەموو تایبەتی یەکی ئەدەبی بێ بەهرە دەبێ .

**سەبکی نوێ**

تا ئەم دوایی یانە کە سەبکی نوێ پەیدا بووە ئاڵ وگۆڕێکی گەورەوگرینگ بەسەر شیعردا نەهاتووە . لە دەورانی جاهیلەتی پێش ئیسلام لە شیعری عەڕەبدا هەموو ئەو کێش و بڕگە عەرووزیانە کەئێستاش کەلکیان لێ وەردەگیرێ بوون تەنیا ئەوەندەیان، فەرق بووە کە عەرووز ناوی بۆ داناون و ئەوان بێ ناو کەلکیان لێ وەرگرتووە .

لەم دوایەدا **نووری شێخ ساڵح و گۆران** بێ لەبەرچاوگرتنی کێش وقافیەی کلاسیک چەند شیعرێکیان بڵاو کردۆتەوە .لەفارسیشدا عەلی ئیسفەندیاری ( نیمایوشیج ) بەبناغە دانەری شیعری نوێ دەناسن کە چەندشاعیری بەناوبانگی دیکەش وەک **نادر نادرپوور** وەدوای کەوتن. چونکە ئەمجۆرەشیعرگوتنەش کە پێی دەڵێن شیعری نوێ نەیتوانیوە بە تەواوی خۆ لەدەست تەنگ و بەربەستی کێش و قافیە رزگار بکا تەنیا سەروگوێی قافیەی شکاندووە بەڵام دیسانیش بەشێوەیەک وەزن و قافیە هەر ماوە کە پێموایە دەبێ پێی

بلێن وەزنی نیمایی . لە کوردیدا گۆران پێی دەڵێ شیعری پەنجە یانی وەک پەنجەی قامک یەکیان کورتە و یەک درێژ .

هەرچەند لەم سەبکەدا شیعری باش و بەرز زۆر گوتراوە بەڵام بەو شێوەیە سەر نەکەوتووە .

بۆ شیعر هەر وەکوو نێوەرۆکی جوان و بەکەلک پێویستە وشەی جوان و لەبەر دڵ نزیک و ڕێک خستنی وشەکان بە گوێرەی قانوونی بەدیع وبەیان وسنعەتەکانی شیعری کارێکی بنەڕەتی و بناغەیی یە و شاعیر ناتوانێ خۆی لێ بپارێزی . زەوقی سەلیم ئەمانەی بەجوانی هەستکردووە و هەر ئەمانەن کە لە شیعردا هونەر دەخوڵقێنن و لە ئاکامدا شتێک لە شیعر دەستدەکەوێ کە پێی دەڵێن هونەر .

خاوەنڕایان لە سەبکی کلاسیکدا لایان وایە بەشی زۆری ئەم وردەکارانە لەشیعردا بەهۆی کێش و قافیە وەدەستدەکەوێ وئەگەر شیعر ئەم وردە کارانەی تێدا نەبێ ناتوانی پێی بڵێی شیعر .

نێوەرۆکی جوان شیعر جوان دەکا بەڵام بووکی جوان دەبێ جلکی جوانی لەبەر کەی وپێی بڕازێنێوە . جوانی شیعر لە هونەری شیعرەکەیدایە . ڕەنگی سوور و سپی نیە بە باڵای شیعرەکەوە دیارە .

بەپێی تاریفی شیعری نوێ دەبێ گیرۆدەی کێش و قافیە نەبێ و ڕازاندنەوەی شیعر بە وشەی جوان و لەبارو لەبەر دڵان لەبەرچاو نەگیراوە یا زۆر پێویستنەزانراوە بە پێی ئەم تاریفە وادیارە شیعری نوێ لە زمان و ئەدەبی کوردیدا شتێکی تازە داهاتوو نەبێ بەڵکە گەرانەوەیەکە کە بۆ هەوەڵ سەردەمی شیعر لە زمانی کوردیدا کە تازە فێربوون گۆرانی بڵێن .

جگە لەوەش هەر وەکوو لە فۆلکلۆر و بەیتی کوردی دەردەکەوێ یا لە شیعرەکانی **پیرشالیاری ، هەورامی ، فەقێ تەیران و حەکاری** دەبیندرێ شتێکی وەک سەبکی نوێ ئەورۆکە بووە . ئەوەندەی جیاوازی هەیە کە

شیعری نوێش وەک هەموو بابەتی دیکەی ئیمرۆ پڕنێوەرۆکتر و ڕێککەوتووترە .

لە زەمانی ئێستادا دەبێ هونەر باسی دەردی خۆی و کۆمەڵ بکا ئەویش بەشێوەیەک هەموو کەسلێی حاڵی بێ و کەلکی لێ وەرگرێ. بەڕاستی هێندێک لەو سەبکە کۆنانەی شیعریان پێ گوتراوە لە هیچ سەردەمێکدا ناتوانێ لەخزمەتگەل دابێ . هەر بۆیە شیعری سەمەرە گوتن وەکوو موعەما لە باو کەوتووە و لەنێو چووە . بەڵام ئەم قسە بەو مانا نیە کە شیعر لە هەموو جوانی و سنعەتی شیعر بێ بەهرە بێ . دەبێ چەند نێوەرۆکی شیعر بە کەلکوجوان دەکەی ئەوەندەش قالبی جوان و زەریفی بدەیەی ، دەنا دەبێتە قسە و نەسر ، ئیدی فڕی بەسەر شیعرەوە نامێنێ .

هەڵبەت زۆر مەسەلەی دیکە لە شیعردا هەیە کە تەنیا زەوقی سەلیم هەڵی نابژێرێ بەڵکوو ئاگاداری شاعیری دەوێ کە ئەگەر نەبێ شاعیر ناتوانێ لەهەل و مەرجێکدا شیعر بڵێ .

نێوەرۆکی جوان وەکوو ئەسپێکی جوانە کە ئەگەر زین و جل وبەرێکی تازە وجوانی لێ بکەی خۆنوێنتر وجوانتر دەبێ هەتا کۆنە قەڵتاخ و زینێکی شرووری لێ بکرێ وبنێرێتە مەیدان .

وەک پێشوو باسمان کرد شیعری نوێ بەو شێوە کە هێندیک لە رێرەوانی ئەم سەبکە دەیانەوێ سەرکەوتوو نەبووە . هەڵبەت ئەوان پێیان وایە هۆی ئەم سەرنەکەوتنە ئەوەیە کە **شیعری نوێ ئێستا جێگای خۆی نەکردۆتەوە** یانی هێشنا رادەی دەرک و فەهمی کۆمەڵ نەگەیوەتە ئەم رادەیە .

ــ زۆرشوپاندن و ئیستیعارەی دوور لە زەین و جار جار لە روانگەی عیلمی یەوە چەوت و هەڵە لە شیعری نوێدا دەبیندرێ . وەک ئەوە :

سلاو بۆ تۆ ، سلاو بۆ تۆ یار
سلاو بۆ تۆ ، سلاوی بۆندار

بەکورتی ئەگەر تاریفی شیعری نوێ یا برگەیی بەم شێوەیە بکرێ دەکەوێتە سەر رێبازێکی راستی عیلمی :

**شیعری نوێ ئەوەیە مەعنای تازە و نوێ لە قالبی تازە و نوێ و بە رستەی تازە و نوێ .**

وەک ئەم شیعرە :

هەرچەند دەکەم ئەو خەیاڵەی پێی مەستم
بۆم ناخرێتە ناو چوارچێوەی هەڵبەستم
بەڵام ئەفسووس کەوا شیعرە جوانانە
باڵدارێکن جێ ناهێڵن هێلانە
لە ناوەوە ئەجریوێنن ئەخوێنن
هەرگیز قەڵەم بە کاغەزا ناهێنن
من بەش بە حاڵی خۆم دڵم بە شیعری نوێ

خۆشە و هیوادارم شاعیرەکانمان تێ بکۆشن پلەی ئەم سەبکە بەرنە سەر و شێوەیەکی جوانی لێ ساز بکەن کە لە دڵدا جێ بکاتەوە

بتوانێ بەباشی شیعری نوێ وەربگرێ بەڵام بەرای من بەڵگەیەکی بەجێ نیە بەڵکوو هۆی سەرنەکەوتنی ئەم رێبازە چەند هۆی دیکەی هەیە وەک :

ــ تا ئێستا هەل ومەرجێکی وا بۆشیعری نوێ دانەمەزراوە کە لە چوارچێوەیەکی عیلمی و دەستووریدا ناودێر بکرێ . ئەگەر لە هونەرمەندێکی ئەم سەبکە بپرسی شیعری نوێ لە روانگەی ئەدەبی یە وەدەبێ چۆن بێ هەر ئەوەندەت پێدەڵێ شیعری نوێ دەبێ لە داوی کێش و قافیەدا بەند نەبێ و شیعرێکی نوێ بۆ نموونە دێنێتەوە . ئیدی ، ئەم تاریفە هەموو شتێکی ئەدەبی دەگرێتەوە بێجگە لە شیعر :

ــ جوانی یەکانی زاهیری شیعر کە سنعەتی شیعرین و راستەوخۆ بە کێش و قافیەوە بەندن . لە شیعری نوێدا لەبەرچاو ناگیرێ . بروانە هێندێک لە شیعرەکۆنەکان بوونە زاراوەی سەر زار و زمانی خەڵک . هۆیەکەشی ئەوەیە کە بەیت بۆخۆی بەتەنێ مانایەکی تایبەتی هەیە کە دڵی خوێنەر بێی ئاو دەخواتەوە .

ع.ه

منداڵێکم تازە لەدایک بوو، ناوم سروەیە هێشتا بەم جۆرەی پێویستە گەورە نەبووم، ناتوانم لەسەر پێی خۆم راوەستم، هەموو هێز وتوانای خۆم دەکار دەکەم تا بتوانم سەربەخۆ بم بۆ ئەوەی کەسێک دەستم بگرێ وهەستمەوە، رێ برۆم و ئەرکی خۆم سەبارەت بە خەڵک وکۆمەڵ بەجێ بگەیەنم. بەڵام داخەکەم زۆر لەمەوبەر لە رابردوودا وایان دەزانی ئەگەر من سەربەخۆ بم، ئەگەر گەورە بم و خۆم بناسم بۆ وان جێگای ترسەو خەتەرم بە دواوەیە.

دایکم کە فەرهەنگی کۆنی خەڵکی کورد بوو، لە هەر دەور و زەمانێک بە هەموو چەشنە کەرەسەیەک دەپەڵوسرا نەیان هێشتووە منداڵی وەک من لە زگێکدا بحجمێ، هەر وەکوو فیرعەون کە لە پێک هاتنی نوتفەی مووسا دەترسا ئاوام لێ دەترسان. بۆ؟ چون بیریان دەکردەوە ئەگەر باب و باپیری دایکم لە من جیا بنەوە بۆ ئەوان زەرەری نابێ.

جا هەوڵیان دەدا من بفەوتێنن بەڵام بەهت بێژان و هونەرمەندان وزانایانی کورد منیان لە زگ وپشتان گێڕاوە تا بەو رۆژە، گەیشتووم! ئیمڕۆ لەدایک بووم، لەدایک بوونی من لەدونیا دەنگی دایەوە لە دوور و نێزیک بەر و دیاریم بۆ دەهات، هەرکەس بەپێی توانای خۆی شتی جوان وبەنرخی نارد، بەڵام کەم! هەموو سەریان سور مابوو، چۆن دەکرێ گۆوارێک بەزمانی کوردی بۆفەرهەنگ و ئەدەبی کورد زیندوو بکاتەوە.

کەچی من هەم، دەمەوێ هەبم، دەمەوێ بە دونیا رابگەیەنم زیندووم، دەمەوێ ئەو کەسانەی کەبە لەدایک بوونی من نارەحەت بوون تێ بگەیەنم کە من نەک خەراب نیم بەڵکوو زۆریش باشم، توانای ئەوەم هەیە کە لە پێشکەوتنی بیر و رای خەڵک وا بەکەڵک بم دەتوانم دواکەوتوویی فەرهەنگی گەلەکەم قەرەبوو بکەمەوە. پێم خۆشە لە خزمەت بە نیشتمان و شۆڕشەکەم ئەرکی گرینگ بە ئەستۆوە بگرم، ئەگەر ....ئەگەر... و ئەگەر تۆش دڵت بۆم دەسووتێ منت خۆش دەوێ، باشی و پێشکەوتوویی منت ئاواتە، تۆ کە ساغی و سڵامەتی من داواکاری، تو کە پێت خۆشە لە خەزێنەی زانست و ئەدەبی تۆ هەموو کەس کەڵک وەرگرێ دەبێ بەپێی توانا یارمەتیم بدەی، ئەو شتانەی هەڵەیان هەیە پێم بڵێ، رەخنە بگری، پێشنیار بکەی، رێنوێنی بکەی و.... هەتا ببم بە سروەیەک کە جێگای باوەر و شانازی گەلەکەم بم.

# غارنشین

ع. نانەوازادە

تاکوتەنیا ،پیروکەلەلا
لەژێر سێبەری رەوەزێک دەستەو
ئەژنۆ دانیشتبوو .گنجی نێو
چاوانی شوێنی ساڵ ومانگی
لەسەر بوون.لەبەرامبەری
دانیشتم. بێ ئەوەی چاوم
لێ بکا ،بەورتەپرسی:

ـ کێی؟

ـ رێبوار.

ـ رێبواری چی؟

ـ رێبواری رێگەی ژیان
وئەوین.

ـ ئەوەی بەرێگەی ئەوین دا
دەڕوا لەژیان بەدوورە!

ـ بەڵام ئەوین خۆی ژیانە.

ـ ئەوین سووتانە!

ـ سووتان ژیانی هەرمانە.

ـ هەرمان درۆیە، هەموو
کەس دەمرێ.

ـ بەڵام ئینسان نامرێ

لێوەچرچەکانی وێک ناوە
چاوی کەم سۆمای پرووش کردو
تێم راما. گنجی نێوچاوان
پتربوون.بێ ئەوەی دەنگی بەرز
کاتەوە بەتوورەیی گووتی:

ـ نەتەنیا من، بەڵکە
زۆری دیکە گەران بەڵام
ئینسانیان نەدۆزیەوە.

ـ ئەوان بەفانۆس دەگەڕان
ئینسان دیتنەوە بەدڵە.

ـ دڵ پارچە گۆشتێکی سوور
وبێ کەلکە ،رێگەوون کەری
شعوورە.

ـ لەوجێگەیەدا کەشعوور
رێی پێ نابا ،دڵ رێگاپێشا-
ندەرە.

ـ چ رێگەیەک؟

ـ رێگەی ئەوین.

ـ رێگەی ئەوین رژدوو
سەخڵەتە ،دەرچوونی لێ نیە

ـ ئێمەئیمانمان بەهێزی
خۆمان هەیە.

ـ مەگەم تۆ تەنیا نی؟

ـ نا من نیم، ئێمەین.

ـ ئێوەکێن؟

ـ ئینسانی نوێ ،داهاتووساز

مات بوو. بەئارامی پرچە
سپی درێژەکانی کەبەسەرشانی
دا بڵاو ببۆوەلای دا. چاوی
خەواڵوی زەق کردەوە. پێی لە
بەندی دەستی رزگار کرد
دەتکوت کێو لەخەوهەڵدەستێ
پرسیارێک لەسەرلێوەکۆنەکانی
بوو.

ـ چتان لەمن دەوێ؟

ـ ئەزموونەکەت.

ـ ئەزموونی من کۆنە
دەردی ئێوە دەرمان ناکا.

ـ نوێ لەسەرکۆن هەڵدەدا،
گیا لەسەر پنجی خۆی شین دەبێ.

پیر بێ ئەوەی ئیترقسەیەک
بکا ،دەستیدا وەکازەکەی و
هەستا .پێکەوەلەکێوداگەڕاین.
من وپیر تێکەڵاوی ئەوان
بووین. ئێمە وەرێ کەوتین
تاکوو رێگەی ئەوین وژیان
ببڕین وشاری خۆشبەختی
سازکەین. سێڵاوهەستا. پیرکە
لەپشت ئێمە دەڕۆیشت بە
دەنگی بەرز هەرای دەکرد؛

ـ ئەوەی لەرێگەی ئەوین
وحەق دابمرێ شەهیدە ژیانی
بێ ژانە... شەهید ژیانی
هەرمانە...

پەرویز جیهانی

ئەحمەدی خانی یەکێک لە ئەستێرە هەرە گەشەکانی ئاسمانی ئەدەبیاتی کوردە کە لە سەدەی یازدەی کۆچی هاتووەتە دونیا.

"مینۆرێسکی" رۆژهەڵاتناسی رووسی لەبارەی ئەحمەدی خانیدا نووسیویەتی. "لە چەند سەدەی ئەم دواییەدا شاعیرێک وەک خانی پێی نەناوەتە سەر گۆی زەوی. خانی لە دەورانی خۆیدا لەباری زانستی رۆژگار بێ وێنە بووە و هیچ یەک لە زانایانی ئەوسەر-دەمەی نەدەگەیشتێ.

پتر لە سەدان کەس لە فەقێکان لە مەحزەری ئەودا خەریکی فێربوونی زبان و زانست بوون."

خانی لە زمان و ئەدەبی عەرەب و فارس و تورکدا شارەزا بووە و بەو زمانانە شیعری گوتووە. بەداخەوە بەشێکی زۆر لە شیعرەکانی فارسی و عەرەبی ئەو لەنێو چوونە وفەوتاون و بەدەستهێنانیان زۆر دژوارە. لەنێو مێژوونووس و رۆژهەڵاتناسەکاندا تەنیا "رودینکۆ" و "ئەمین زەکی بەگ" باسی شیعری فارسی و عەرەبی ئەحمەدی خانی دەکەن شاعیرانی کورد هەموو بە یەک بیرورا و هاو دەنگ لەبارەی شیعر و ئەدەبیاتی خانیدا سەری بۆ دەچەمێنن و رێزی لێ دەگرن. خوا لێ خۆشبوو حاجی قادری کۆیی شاعیری سەدەی سێزدەی کۆچی لەبارەی خانیدا دەفەرموێ:

ئەحمەدی خانی ساحەبی مەم و زین شاهبازی فەزایی علیین. مامۆستا هەژار شاعیری هاوچەرخ کە مەموزینی خانی کردووە بە موکریانی لەبارەی خانیدا دەڵێ:

"زۆرزانی و بیر و وێژەوانی
پارچێکە برا بە بەژنی خانی
خانی وەکوو رۆژە تیشکی داوێ
پێی ناوێ بدەم پەسەندی تاوێ
ئەو باغی گوڵان و من بژارم
بیر لەو دەکەمو دەڵێم هەژارم

بەداخەوە بەسەرهات و مێژووی ژینی ئەم

شاعیرە گەورە وەک بەسەرهاتی زۆربەی شاعیرانی کوردستان باش روون نیە و ئەو بەسەرهاتەی کە لە بارەی ئەو شاعیرەدا بە دەست مانەوە زۆر نویشکانە .

ماموستا خانی ناوی " ئەحمەد"ی کوری " ئەلیاس"ی کوری " رۆستەم بەگ "لەعەشیرەتی خانی بووە کە بە گوێرەی نووسینی خۆی لە دوایی کتێبی " مەموزین" دا، سالی ١٠٦١ کۆچی مانگی بەرامبەر ١٦٥٠ میلادی لە شاری " بایەزید"ی کوردستانی تورکیا هاتووەتە دونیا . خۆی لەو بارەوە دەڵێ :

**لەورا کو دەما ژ غەیب فەک بوو**
**تاریخ هەزار وشێست و یەک بوو**

واتە ئەو دەمە کە من لە دونیای غەیب و نادیار جودا بووم مێژوو ئەوەندە بوو.

" خانی" دەرسەکانی سەرەتایی لە مەدرەسەی " مورادیەی بایەزید" دەخوێنێ و پاشان بۆ تەکووزکردنی زانستەکەی دەچێتە شارەکانی ئوورفا ، ئەخلات ، بتلیس ."لەدوای گەرانی ئەو شارانە سەرێکیش لە ولاتی " میسر" دەدا . لەوێ زانستەکانی " سەرف و نەحو" بەدیع و بەیان و تەفسیر بەباشی فێردەبێ ودەگەرێتەوە بۆ بازێری " بتلیس" و لەوێ ئیجازەنامەی مەلایەتی وەردەگرێ و دەبێ بە مەلا ودەچێتە زێدەکەی خۆی و لە بازێری بایەزید لە مزگەوتی " مورادیە"ی ئەو شارەدا خەریکی رێنوێنی خەلک و دەرس گوتنی مندالان دەبێ .

بنەمالەی خانی هەموو ئەهلی دین وزانست بوونە و پێش لەدایک بوونی خانی لە ناوچەکانی جزیر و بوهتان بۆ ئەو مەلبەندە جێ گوز بوونە. خانی ناسناوی خۆ لە ناوی عەشیرەتەکەی خۆ وەردەگرێ .

لە بابەت رادەی تەمەنی خانی لە نێوان مێژوونووساندا برێک بیروڕای جیاواز هەیە هێندێک لەسەر ئەو باوەڕەن کە خانی ٥٨ سال ژیاوە بەلام برێک دەلێن کە خانی تەمەنی ٧٤ سال بووە : بەلام خانی خۆی دەنووسێ کە لە تەمەنی چل وچوار سالیدا خەریکی تەواوکردنی کتێبی " مەموزین" بووە :

**خەتێ تەیە سەرنوشت و سەر مەشق**
**سێ سالە خەتێ خەتا دکەت مەشق**
**ئیسال گە هەشتە چل و چاران**
**ڤی پێشرەوێ گونەهکاران**

خانی لە کتێبی " مەموزین"دا گازندە لە چونەتی ئالۆزی رۆژگاری خۆی دەکاو دەلێ :

**چ بکەم کو قەوی کەسادە بازار**
**نینن ژ قوماش را خەریدار**
**یەعنی ژ تەمەع دراف و دینار**
**هەر یەک ژ مەڕا وەبوونە دلدار**
**گەر علم تەمام بدەی بەپۆلەک**
**بفروشی تو حیکمەتێ بە سۆلەک**
**کەس ناکەتە مەیتەرێ خوە جامی**
**را ناگرتن کەسەک نزامی**

خانی لەو سەردەمەدا کەوتە خەمی زمان و ئەدەبی کوردی و خەریکی نووسین بوو، ئێستا چەند کتێب و شوێنەواری بەنرخی بەجێ ماوە کەوا لە خوارووە شروڤە دەکەین :

١ـ نەوبەهار کە یەکەمین فەرهەنگی زبانی کوردی یە .فەرهەنگی نەوبەهار کە نەوبەهاری بچووکانی پێدەلێن بە عەرەبی و کوردی بۆ فێربوونی مندالان نووسراوە. خانی خۆ لەو بارەوە گوتوویەتی :

**ژ پاش حەمد و سەلەواتان**
**ئەڤ چەند کەلیمە ژ لوغاتان**
**ڤێک ئێخستن ئەحمەدێ خانی**
**ناڤێ نۆبەهارا بچووکان لێ دانی**
**نە ژ بۆ ساحب رەواجان**
**بەلکە ژ بۆبچووکێد کورمانجان**

فەرهەنگی نەوبەهار لە پێشەکی یەک و سێزدە بەش پێک هاتووە. ئەو فەرهەنگە لە سالی ١٠٩٤ ی کۆچی مانگی نووسراوە .فەرهەنگی نۆبەهار یەکەم جار بە کۆششی " یوسف زیائەدین پاشا " لەگەل فەرهەنگی " الهدیە الحمیدیەفی لغەالکردیە" چاپ بووە.

٢- عەقیدا کوردی :

ئەم کتێبە لەبارەی عەقیدە و ئوسوولی دینی ئیسلام بەزبانێکی سادە وپاراو بە شێعر نووسراوە بەڵام مێژووی نووسینی ئەم کتێبە روون نیە رەنگە ئەوە پێش کتێبی "مەموزین" نووسرابێ . عەقیدا کوردی ساڵی ١٨٩٧ میلادی لە شاری ئەستەنبوڵ چاپ بووە .

٣- یووسف و زولەیخا

خانی ئەم کتێبەی بەزبانێکی شیرین و بە شێوەیەکی ساکار نووسیوە. لەم کتێبەدا بەسەرهاتی یووسف و زولەیخا بە گوێرەی رەوایەتی قورئان و هێندێک لە بیرو رای خەڵکی گوتراوە.

مێژووی نووسینی ئەم کتێبە دیار نیە " مامۆستا گیو موکریانی" نووسیویەتی کەئەم کتێبە تا ئێستا چاپ نەبووە . هێندێک لە لێزانان لەسەر ئەو بیروباوەڕەن کە ئەم کتێبە هی خانی نیە ، ئەوانە بۆ بنەجێ کردنی قسەیان هیچ بەلگەیەکیان نیە ، هەر تەنیا ساکاری نووسینی ئەم کتێبە ئەوانەی بە هەڵە بردووە ، دەنا ئەم کتێبە هی ئەحمەدی خانی یە

٤- مەم و زین

شاکاری ئەحمەدی خانی ئەم کتیبەبەنرخەیە کە بەرزترین و بەناوبانگ ترین کتێبی ئەدەبیاتی کوردی یە . بە نووسینی ئەم کتێبە خانی ئەرکی خۆی لە هەمبەر زمان و ئەدەبی کوردی بەجێ هێناوە و سەربەستی و ئازایەتی خۆی لەم کتێبەدا پێشانی داوە. خانی سووجی پاشمانەوەی گەلی کورد لە ئەستۆی وەزیر و گزیراندا زانیوە و هەمیشە لایەنگری بەلەنگازان بووە. خانی پیرەوی رێبازی " رئالیسم" بووە و سەربهۆری"مەموزین" یش زۆر لە حەقیقەت و راستی نێزیکە. گەلی کورد تا ئێستاش شانازی بەو شاعیرە مەزنە دەکا ، چون خانی دەردی دلێ گەلەکەی لەقالبی چیرۆک دا نووسیوە و هاواری گەلی کوردی بە گوێی هەموان گەیاندووە و گوتوویەتی کەکورد بێ فەرهەنگ و مەعریفەت نیە و دەتوانێ بە زبانی زک ماکی خۆی کتێب و نووسینی هەبێ :

دا خەلق نەبێژتن کو ئەکراد
بێ مەعرفەتن، بێ ئەسل و بونیاد
ئەنواعی ملەل خودان کتێبن
کورمانج تەنێ دبێ حسێبن
هەم ئەهلێ نەزەر نەبێن کو کورمانج
عیشقێ نەکرن ژ بۆ خوە ئامانج

کتێبی مەموزین تا ئێستا بە چەندین زمان وەک رووسی ، فەرەنسی ، ئینگلیسی ، ئاڵمانی و عەرەبی وەرگەڕاوە. یەکەم جار"ئوژن پریم" و " ئالبێرت سون" لە ساڵی ١٨٩٠ ی میلادی کتێبی مەموزین یان لە بەرەڤوکێکدا بەناوی " کۆمەڵێ چیرۆک و شێعری کوردی" بە ئاڵمانی بلاو کردوتەوە .

٢- " ئا ،و ،ن ،لوکوک" ساڵی ١٩٣٠ بەشێک لەمەموزینی بە فەرەنسی تەرجومە و بلاو کردوتەوە .

٣- " هوگوماکاس" ناوێکیش لە ساڵی ١٩٢٦

میلادی هێندێک لە "مەموزین"ی چاپ و بڵاو کردوتەوە.

٤- رۆژهەڵات ناسی فەرەنسی "رژەلسکۆ" مەم وزینی بەناوی "مەمێ ئالان" لە کتێبێک بە ناوی "Texts Kurds" بەهاوکاری ئەنستیتۆ ـی فەرانسە لە دەمێشق دا چاپ وبڵاو کردووە "لسکۆ" لەبارەی مەموزینی خانی دا دەڵێ :

بێ گومان مەزنترین شاکاری ئەدەبی کوردی و روژهەلاتی نێوین مەموزینی خانی یە، کە لە نۆ سەدەی ئەم دوایی یەدا هاوتای نیە.

٥- پروفسور "ئۆسکارمان" رۆژهەڵات ناسی ئالمانی کەکۆمەڵێک ئەدەبیاتی عامیانەیکوردی بە ناوی "توحفەی موزەفەریە" کۆکردۆتەوە لەبارەی بەیتی مەموزین دا کە بە شێوەی عامیانە گوتراوە دەڵێ :

" مەم وزین پڕ بایەخترین شوێنەواری ئەدەبی کوردی یە.

٦- ئەلیکساندرژابا " رۆژهەڵات ناسی رووسی ئەندامی کۆنسولگەری رووس لە شاری ئەرزرووم خەریکی کۆکردنی وشە و ئەدەبی کورد بووە کە کتێبی " مەموزین"ی وەدەستهێناوەو رەخنەیە ـ کیشی لەسەر نووسیوە و بە زبانی فەرەنسی وەری گێراوەتەوە. ئەو کتێبە لەپاش ژابا بە دەستی " لێرخ" رۆژهەڵاتناسێکی فەرەنسی چاپ بووە .

٧- " رۆدینکو" رۆژهەڵات ناسی هاوچەرخی رووس کە لە سالی ١٩٢٦ی میلادی مەموزینی خانی بە رووسی وەرگێراوە و رەخنەیەکیشی لە سەر نووسیوە و لەگەڵ مەتنی کوردی لە چاپی داوە. لەبارەی مەموزین دا دەڵێ :

" مەموزینی خانی لە رێزەی شاکارەکانی ئەدەبی هەرە مەزنی دونیادایە، مرۆ دەتوانێ بلێ کە ئەو شوێنەوارە هەرە بەرزەی خانی هاوسەنگی " شانامەی فێردەوسی و ئیلیاد و ئۆدیسەی هومیر"ە .

٨- " ئۆربیلی" رۆژهەلاتناسی گورجی لە سەرەتای کتێبێکدا کە بە بۆنەی لە دونیا دەرچوونی " روستافیلی" شاعیری بەناوبانگی گورجی نووسیویەتی، لە بارەی خانی دا دەنووسێ کە خانی هاوسەنگی فێردەوسی بووە.

پێنجەمین شوێنەواری خانی دیوانی خانی یە کە بەداخەوە بەشی زوری ئەو دیوانە لەنێو چووە و نەماوە. خانی هەر وەک گوتمان بە چوار زبانی کوردی و فارسی و عەرەبی وتورکی شارەزا بووە و بەو چوار زبانە شێعری گوتوە

ئەوەش نموونەی شێعری چوار زبانی خانی یە :

فَاتَ عُمْرِي فِي هَوَاكَ يَا حَبِيبِي كُلِّ حَال
آەونالە همدمم شد در فراقت ماەوسال
گر بینم قانیم دیلرسن چوقدن اولمیشدر حلال
دین وئەبتەر بووم ژ عێشقێ من نەما عەقل و کەمال
اَنْتَ فِكْرِي فِي فُؤَادِي اَنْتَ روحی فِي الْجَسَد
لشکر غمهای تو ملک دلم ویرانە کرد
ذادە گلدیم‌عشق الیندن ایستیرم سند ن مدد
وان تەتاران بر بەیەغما عەقل ودین و مولک و مال

# زەنبیل فرۆش

ئـەی دلّ بجـۆش ئـەی دلّ بجۆش
جا مێک لـە عەشقی مـەی بنـۆش
دەکەین بـەحسی زەنبیـل فرۆش
دەسـت پـێ دەکـەین حێکا یەتـێ
زەنبیـل فـرۆشـم پادشـا بوو
عـەدالـەتـی بـێ هـەمتـا بوو
دا یـم دە. رێگـای چـاک دابوو
مـوجـود لـە زیکـر و تا عەتـێ
ئـەمجا بەئیرادەی ئەللّای لەسەر
ئـەو پـادشـای لاوی منـدالّ
تەشریفی چوو بۆ ڕاو و شکـار
مردوێک مردبوو لەئەهلی شـار
لێی وەخڕ ببوون دۆسـت و برا
هـەم جیران وهـەم ئیمـاندار
جا پادشام دەچوو بۆ ڕاووشکار
رووی دەکـردە سـەحرا وکۆهسار

بـە ئیرادەی ئـەللّای لـەسـەر
مردوێک مردبوو لە ئەهلی شار
پادشام دەچـووەسـەر قـەبری
بـە جان ودلّ پێـدا فکـری
دەراسـت قـەلبـی دا
ئـەو پـادشـای سـە نتەتـێ
دەجـا پـادشـا دەیگـوت
بێنـن جێـی بـۆ چـاکـەن
لێفـە و دۆشـەگـی بـۆ ڕاخەن
رەفیقـی بـۆ پـەیـدا بکـەن
بـا مـەجنوون نەکێشێ عەزیەتێ
دەجـا مـەلا دەیگـوت
ئـەی پـادشـا فکـرت نیـە
مـردوو زینـدوو رەفیقـی نیە
لێفـە و دۆشـەگـی بـۆ چیـە
مـەگـەم کفـن زیـاتـر بـەرێ

دەجـا پـادشـا دەیگـوت
ئـەی مـامـۆستـا حالّیم بکەن
ئـەمنیـش بمـرم وام لـێ دەکەن
هـەروام جێگـا بـۆچـا دەکەن
رەفیقـم بـۆ پـەیـدا نـاکەن
تـاکـوو نـەکێشـم غـوربـەتـێ
ئەمجـا مەلا دەیگوت ئەی پادشا
ئەتۆش بمری هەروات لـێ دەکەین
هەروا جێگـات بـۆچـا دەکەیـن
رەفیقـت بـۆ پەیدا نـاکـەیـن
مـەگـەم کفـن زیـاتـر بـەری
ئەمجا لـەو پادشای لاوی منـدالّ
بە وەزیر و مـالّ و عـەیـال
ئەودەم بەجێ راوی کرد بەتالّ
تـەشـریفـی هـاتـەوە بۆ مـالّ
ئـەو پادشای سـەنتـەنـەتـێ ٢

ئەمجا پادشا هاتەوە بۆ ماڵ
رووی کردەوە حەوشە و حەسار
ژنێکی بوو روومەت بە خاڵ
عومری کەم بۆ حەینی عومری
بۆ بیست و دوو ساڵ
مانگێک بوو هێنابوویە ماڵ
هێنایە سەر تەڵاقەتێ
ئەمجا پادشا دەیگوت
ژنە بێنە ئازادت کەم
چیدی پادشایەتی ناکەم
غەرقە و بووزووی لەبەر دەکەم
لە ترسی خالەق ناوێرم
زۆر تیژە رۆژی قیامەتێ
دەمجا ژنەکەی دەیگوت
پادشا چ بووە چت بیستووە
ژن ئازادکردن نەبووە
ئەتۆ چ بکەی منیش وادەکەم
من گەدایەتیت دەگەڵ دەکەم
مەمهێنە سەر تەڵاقەتێ
ئەمجا پادشا دەچوو ئاوای دەکرد
وەزیریش ڕای بە پادشا دەکرد
گەنج و تۆماری بخشیوە
هی فەقیر بوو خەنی دەکرد
ئەو پادشای سەنتەنەتێ
ئەمجا پادشا مدەچوو ئاوای دەکرد
منزڵەکی بۆ خۆی پەیدا دەکرد
تا چل شەوی تاعەتی دەکرد
ئەو پادشای سەنتەنەتێ
ئەمجا بەئیرادەی ئەڵڵای لەسەر
گەر چل شەوە دەبوو تەواو
ئارەزووی کرد هاتەوە ماڵ
ئەو پادشای سەنتەنەتێ
ئەمجا گەر پادشا هاتەوەبۆماڵ
لەپشت دەرکەی خۆی دەگرێ
ژنەکەی هەروا کفریان دەکا
دەڵێ ئەو تاعەتی پادشادەیکا
خودا هیچی قەبووڵ ناکا
بەبێ خواردن دێرەم دەکا
نەوسی گوناحکار کوێر ناکا
دەمجا دەگەڕاوە دوایە
لەخودای دەکرد تەمەننایێ
دیگوت ئەهلی شاریمخێران دەکەن
ژنەکەم هەروا کفریان دەکا
دەڵێ ئەوتاعەتی پادشام دەکا
خودا هیچی قەبووڵ ناکا
بەبێ خواردن دێرەم دەکا
دەمجا یەک لەغەیبەوە مبانگدەکا
ئەی پادشا فکری مەکە
هەستە تۆ لێرە بار بکە
تۆ زەنبیلان دروست بکە
معاشی پێ پەیدا بکە
دەمجا پادشا دەچووئاوای دەکرد
رووی لەشاری غەزنەی دەکرد
ئەو زەنبیلەی دروست دەکرد
لە بازاری پوڵی دەکرد
معاشی پێ پەیدا دەکرد

* * * *

جادەڵێ زەنبیلەی بە دەستەوە
بوون بەنێو شاریدا دەهاتە
خوارێ دەیکوت کێ زەنبیلەی
دەوێ زەنبیلە !
کە وەختێکی ڕێگای کەوتە
سەراپەردەی خاتوونەی بە بەر
سەراپەردەی خاتوونەی داهات
خاتوونە لە بالەخانەی کەچاوی
پێکەوت ئەوە یەک نەفەر
زەنبیلەی بەدەستەوەیە دەڵێ
کێ زەنبیلەی دەوێ زەنبیلە .
دەڵێ بەقەرەواشی کوت ، ئەی
عافرەت برۆ ئەوزەنبیل فرۆشەم
بۆ بانگکە بێتەسەرێ ئەمن
زەنبیلانی لێ قیمەت دەکەم .
ئەویش کوتی زەعیفە هەر
کەسێکی زەنبیلەی لەمن دەکڕێ
زەنبیلەی من حەقی چاردە
شاییە.یەکی دەوێ،دووی دەوێ
چەندی دەوێ بێ زەنبیلانم لێ
بگێرێتەوە وپوڵەکەم داتێ .
چوو سەری بەخاتوونەی ڕاگەیاند
کوتی :
خاتوونە دەگەڵم نایەتە
سەرێ زەنبیل فرۆش .جا دەڵێ
خاتوونە لەسەر بالەخانەی
سەری هێنا دەرێ کوتی :
زەنبیل فرۆش وەرە سەرێ
ئەمن سوئالێکی شەرعیت لێ
دەکەم . زەنبیل فرۆشیش چون
پیاوێکی مسوڵمان بوو. ئەگەر
کوتی سوئالێکی شەرعیت لێ
دەکەم دڵی نەرم بوو رۆیشتە
سەرێ .

* * * *

ئەمجا لەوخاتوونەی چاوسەحەتی
لەو خاتوونەی چاو مەستە
برامبەری ڕادەوەستا
دەیکوت یاخودا زۆربەخێربێ
ئەی لاوی زەنبیل بەدەستە
دەیجا زەنبیل فرۆش دەیکوت
ئەی خاتوونەی ڕەنگ مەڵەکە
بۆچت بانگ کردوومە سەرێ
تەڕدەست بە سوئالێ بکە
وەرە رەجایت لێ دەکەم
چی دیم لێرە محتەل مەکە
دمجالەوخاتوونەی چاو سەحەتی
لەفزی شیرێنە وەک نەباتی
دەیکوت زەنبیل فرۆش وەرەکنم
وێت دەم خەڵات و بەراتێ
دەمجا زەنبیل فرۆش دەیکوت
ئەی خاتوونەی بەڵەک چاوێ
مەمخە نێو داوی گەرداوێ
لە خەوفی خالەق ناوێرم

خەڵات وبەراتمم ناوێ
دەمجا خاتوونە دەیکوت
زەنبیل فرۆش بەقسەم بکەی
غەرقە و بووزوت پێ فرێ دەدەم
خاراو دارات لەبەر دەکەم
وەرە سەر ڕێی مەسلەحەتێ
ویت دەم تانجی سەنتەنەتێ
دەمجا زەنبیل فرۆش دەیکوت
خاتوونە تەختی تۆم ئاگرن
غەرقە وبووزووی خۆم چاترن
خاراو دارای تۆم ئاگرن
لە ترسی خالەق ناوێرم
زۆر تیژە ڕۆژی قیامەتێ
دەمجا خاتوون دەیکوت
زەنبیل فرۆش جەماڵ نوورە
قسان دەکەی بە دەستوورە
دەستم دەگەڵ تێکەڵ بکە
ڕۆژی قیامەتێ زۆر دوورە
دەمجا زەنبیل فرۆش دەیکوت
ئەی خاتوونەی حوکمات دەکا
چیدیم لێرە مەحتەل مەکە
لە خەوفی خالەق ناوێرم
ڕۆژی قیامەتی نێزیکە
دەمجا خاتوون دەیکوت
زەنبیل فرۆش دڵم کەوتە هیلاکەتێ
وەرە سەر ڕێی مەسلەحەتێ
دەیدەم تانجی سەنتەنەتێ
وەرە ئەمن مارە بکە
زۆر دوورە ڕۆژی قیامەتێ
دەمجا زەنبیل فرۆش دەیکوت
ئەی خاتوونە ئەمنیش وابووم
من دەجێی خۆمدا پادشا بووم
لە ترسی ڕۆژی قیامەتێ
بۆیە لە تەختی جودا بووم
دەمجا خاتوون دەیکوت
زەنبیل فرۆش بەقسەم نەکەی
جەلادانت لێ بانگ دەکەم
ئەلحان سەرت بێ گیان دەکەم
وەرە سەر ڕێی مەسلەحەتێ
وێت دەم تانجی سەنتەنەتێ

لە تەرەف خودای وا ئیلهام کرا بە فیلەکی دلخۆشی خۆی بداتەوە وخۆی نەجات بدا . زەنبیل فرۆش کە وەختێکی لە تەڕەف خودایەوە وادەگێڕنەوە کە خەندەی هاتێ حالێ کرا . خاتوون پێی کوت :

زەنبیل فرۆش بۆچی خەندەت هاتێ ؟

دەمجا زەنبیل فرۆش دەیکوت
ئەی خاتوونە نەمزانی وادەکەی
وەمزانی پرسم پێ دەکەی
دەستم دەگەڵ تێکەل بکە
قانعم بە وێ نیعمەتێ

دەمجا زەنبیل فرۆش ئەنجەتی کرد بۆ سەر ئاوێ
خاتوون بەقەرەواشانی ڕاخوڕی
هەڵ گرن مەسینە لە دوای کوڕێ
ئەمجا لەو قەرەواشە نازەنینە
لەدوای هەڵ دەگرت مەسینە
دەیزانی زەنبیل فرۆش پیاوێکی بە دینە
بە عەدەب لای داو گەڕاوە
بوری لەبەر خودای دەپاڕاوە

جا دەلێ زەنبیل فرۆش لە بالەخانەیەکی یەک جار ، یەک جار زۆر بلێند بوو . دستی کرد بە موناجاتێ. هەر مەنزوری ئەوەی بوو کە خودای تەباڕەک و تەعالا روحمی پێ بکاونەجاتی بدا .

دەمجا زەنبیل فرۆش دەیکوت
یا ڕەبەننا حەزرەتی ئادەم دەگەڵ حەوا
گەنمیان خوارد و فڕی دران
سەبارەت بەخۆشەویستی عەفوو کران
ئەمنیش وەبەر تۆم هانایە
دمجا زەنبیل فرۆش دەیکوت
یا ڕەبەننا حەزرەتی ئیبراهیمی خەلیل
کافران بۆیان وەسەریەک ناوە
سەد هەزار ،هەزار تۆن بارەدار
ئەو تێکیان دا قەومی کوفار
بلێندیان کردووە وخستیانە سەر
بۆی کرد بەمێرگ و میرخوزار
ئەمنیش وەبەر تۆم هانایە
یا ڕەبەننا حەزرەتی ئەییووب
کرمان هەموو قالبیان دڕی
چاکت کردەوە بەبابی فیلێ کوڕی
ئەمنیش وەبەر تۆم هانایە
یا ڕەبەننا حەزرەتی یوسف
بەندەت بۆ دێنەوە بیر
برایان بردیان خستیان لەبیر
یا ڕەبەننا بردت لەمیسرت کردە میر
ئەمنیش وەبەر تۆم هانایە
یا ڕەبەننا حەزرەتی وێنس
بە ئیرادەی تۆ بوو،ئەڵڵا
یا ڕەبەننا کەوتە دەریا
لە زاری ماسی دا نەجاتت دا
ئەمنیش وەبەر تۆم هانایە
یا ڕەبەننا حەزرەتی ئیسماعیل
بووە کۆچی قوربان
ئەو نەیدەبڕی تیغی دەبان
سەبەبێ تۆ بووی یا ڕەبەننا پشتیوان
ئەمنیش وەبەر توم هانایە

درێژەی هەیە

ویرای سپاس لە      عەزیز کەیخوسرەوی

# وت و وێژ لەگەڵ : موحەممەد قازی

لەسروەی ژمارە دە دا ، کورتەی ژیانی ئێوە لەزمان خۆتان بڵاو بۆتەوە .پاشئەوە کەخەڵک لەبەسەرهاتی ئێوە ئاگاداربوون گۆواری سروە بە دەرفەتی زانی چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ ئێوەبێ ولەباری کاری ئەدەبی ئێوەوە چەند تێبینی بدا بەخوێنەرانی بەڕێزی سروە . جاکەوابوو بە ناوی هەوەڵین پرسیار تکایە بفەرموو .

١ــ تەرجەمەچیەوهۆیسەرکەوتنی ئێوە لەوەرگێڕانی کتێبدا چیە ؟

ئیزنم بدەن بەرلەهەمووشت سپاسی گۆواری سروە بکەم کە منیان شیاوی لوتفی خۆیان زانیوە وبەرجی ئەوە کە دەزانن من بەهۆی پەڕیوەبوون لەزێد ودیاری خۆم (کوردستان) وبارهاتنی من لەشاری فارس نشین ودرێژەدان بەخوێندنم هەر بەم زمانە، بەو جۆرەی دەبوو نەمتوانیوە شارەزای ئەدەب وفەرهەنگی کوردی بم و بەبڕوای خۆم دەبوو نیوەیئەم خزمەتەی بەزمانی فارسیم کردووە بەزمانی کوردیم کردبایە ، دیسانیش سووچێک لەژیانی منی لەسروەهاویشتووە وئێستا ئەمزەحمەتەیان وەبەر خۆناوە وهاتوون بۆ وت وویژ. سەرلەنوێ سپاسی سروەوبەڕێوەبەرانی دەکەم.

پرسیاری یەکەم :تەرجەمەچیە ؟

وەڵام: هەموو دەزانین ئادەمیزاد بەپێی پێداویستی ژیان ودیاردەکانی تەبیعی لەکەڵین وقوژبنی دونیا بڵاو بۆتەوە وبنەماوئێل وعەشیرە وکۆمەڵی پێک هێناوە ولە ئاکامدا هەرئەوانە بوونە هۆی پێک هاتنی نەتەوەکان .

جاهەرکام لەوانە بەپێی هەل ومەرجی رابواردنی ژیان،بۆ چوونی جیاوازیان لەتەبیعەت بووە وبۆدرکاندنی نیازی خۆیان هەریەکە وشەیەکی تایبەتییان دەکار کردووە کەئەم وشانە بەپێی چەند پاتەبوونەوە لەنێو خەڵکدا بوونە زمانێکی یەکگرتوو .

راولێژی جۆراوجۆری وشە لە

زمانێکی هاوبەشدا بۆتە هۆی
پێک هاتنی زاراوە ولەهجە.
ئەگەرچی دیارەوەختێک مەودای
نێوان کۆمەڵەکانی بەشەر
زۆرتر بوویا وجیاوازی نیژادی
تەوژمێکی فرەتری ببوایە، هەر
کۆمەڵەی بۆخۆی زمان و
راوێژێکی سەربەخۆی
پەیدادەکرد کە خەڵکی
لەوان دوورتێی نەدەگەیشتین.

دوایە بەرەبەرە ئینسان
دەوری هەوەڵی ژیانی سەرەتایی
هەڵبواردوبەکەڵک وەرگرتن
لەکەرەسەی ئاسن وبەردین
و...پێی نایە رێبازی شارستا
- نەتی و وردە وردە گەیشتە
رادەیەک کەنیازی بەمە پەیدا
کرد بۆ باشتر ژیان پێوەندی
لەگەڵ کۆمەڵی دەوروبەری،
خۆی نزیکتر بکا ولەپێشکەوت
ودەستکەوتی نوێ کەڵک
وەربگرێ. ئەوەش بەر لە
هەمووشت پێویستی بەوەبوو
کەلەزمانی ئەوان حاڵی بن.
ئەم سەرکەوتنە بۆهەموو
ئەندامانی کۆمەڵ نەدەلوا
چون گیروگرفت رۆژ لەرۆژێ
پتر دەبوو، هەموو خەڵک
بەفێر بوونی هەموو زمانان
نەدەوەستان.

لەوەها هەل ومەرجێکدا
دەستەیەکی هەڵبژاردەسازبوون
وزمانی ئەوکۆمەڵ ونەتەوەی
کاریان پێی بوو فێربوون
وئەودەم دەستیان کرد بە
وەرگێرانەوەی زانستەکانی
ئەم نەتەوانە ونەتەوەکەی
خۆشیان فێرکرد.

لێرەدا بناخەی فەننی
تەرجومە دارێژرا. ئێستاش
دەبینین کە زمانێکی
یەکگرتووی وەهانیە کە بۆ
هەموولایەک سانی بێ وهەموان
تێی بگەن.هەڵبەت رەنگ بێ
زمانی وەک (ئیسپرانتۆ)هەبێ
بەڵام ئەویش جێی خۆی
نەکردۆتەوە تا هەموو بیرو
زانستێکی پێ بنووسرێ. لە.
لایەکی دیکەشەوە رادەی،
تێگەیشتن وزانستی بەشەر
چ لەباری زانست وفەننەوە چ
لەباری هونەروئەدەبەوە لە
وڵاتە پیشکەوتووەکان بەوپەڕی
خۆی گەیوەو وەرگێرانەوەی بۆ
ئەم خەڵکەی لەباری پێشکەوت
وئاڵوگۆڕەوە بەرەژێرترن
زۆر پێویستە.تەرجەمە پەرەی
سەندووە ووەک زانستێکی
سەربەخۆی تایبەتی لێهاتووە.

رەمزی سەرکەوتنی ئێوە لە
کاردا چیە؟

هیوادارم ئەم پرسیارە.
تەعاروف نەبێ وئەوەتان
بەراستی بێ. بەهەرحاڵ
ناچارم وەڵامی ئەم پرسیارە
ئەگەر هێندێک لەراستیش
نزیک بێ - بدەمەوە!

یەک لەهۆیەکانی بەقەولی
ئێوە سەرکەوتنی من لەتەرجو
- مەدا لەبەرچاوگرتنی
هێندێک ئەسڵ وقاعیدەیە کە
بۆ وەرگێرانێکی سەرکەوتوو
پێویستە. هەڵبەت ئەم ئەسڵ
و قاعیدانەم بەوردی نووسیوە
وبۆتان دەنێرم.

چۆن بووکاری تەرجەمەتان
دەست پێکرد؟

نازانم لەسەرگوزشتەی
خۆمدا نووسیومە یاناکەمن
ساڵی ۱۳۰۷ لەمەهاباد تازە
خوێندنی سەرەتاییم تەواو
کردبوو، چاوەروانی ئەوەبووم
گرێ پووچکەی کاری ژیانم
بکرێتەوە.ماوەی چەند مانگ
بێکار بووم لەوماوەدا لە
خزمەت خوالێخوشبوو
عەبدوورەحمان گیومکریانی
کەتازە لەعێراقەوە هاتبۆوە
مەهاباد، خەریکی فێربوونی
دەرسی فەرەنسەبووم. ساڵی
۱۳۰۸ بۆ درێژەی خوێندن
چوومە تاران ولەژێر
چاوەدێری خوالێخوشبوو
دکتۆر جەودای قازی لە،
دارولفنوون دەستمبە خوێندن
کرد.

لەوێ زمانی فەرەنسە لە
رێزی بەرنامەی ددرسخوێندنی
مندابوو. بەپێچەوانەی
ئێستاکە زمانی خاریجی لە
فێرگەئینگلیزی یە .ئەوەندە
دەرسەی لەخزمەت ماموستا
گیوم خوێندبوو بەهۆی ئەوە
کە هەمووماوەی خوێندنی
فێرگە وزانستگە، یەکێک لە
خوێندکارە هەرباشەکانی
دەرسی فەرەنسەبم.

ئەودەم زۆر کتێبی وەرگێر
- اوەم دەخوێندەوە. هەستم
دەکرد زوربەی وەرگێرەکان
کارەکەیان ناپوختەوشەورستەی

زۆرنا لەبارو دزێوی تێدا یەو
بەجێی ئەوە لەزمانی
تەرۆپاراوی دەری کەلک
وەربگرن بەزمانێکی نارێک و
پێک کتێبەکانیان
وەرگێراوەتەوە و خوێنەر
جاڕز دەکەن،ئەوە ئاواتی
دڵم بوو کەرۆژێک بتوانم ئەم
کارە (تەرجوومە) بکەم هەتا
وەختێک دوای زانستگەمنیان
بۆخزمەتی سەربازی ناردە،
زانستگەی ئەفسەری.

لەوێ هێندێک شت وەک
پێویست بوو کەبیکرین ولەگەڵ
خۆمان بیبەین.بەڵام ئەشیایە
خودام شک نەدەبرد. ناچار
بووم کتێبی" کلود ولگرد"ی
وێکتۆر هۆگۆ بفرۆشم کەلە
زانستگە بۆتاقی کردنەوەی
خومەوە رمگێرابووبە ٥٠ تمەن
بەئینتشاراتی ئەفشاریم
فرۆشت وگرفتی خۆم پێ چارەسەر
کرد. ئەوە هەوەڵین کاری من
بوو. تا حەوت هەشت ساڵ پاشان
ساڵەکانی ١٣٢٧و ١٣٢٨ کەوردە
وردەگرفتی ئیداری وگرۆتینی
لاوەتیم دامرکا وتوانیمدەست
بەوەرگێڕانی کتێب بکەم. تا
ئێستا نزیک بەشێست کتێبم
وەرگێراوەتەوە سەر فارسی.

ئێستاش ئەمکارەم پێخۆشەو
بەرجی زۆری تەمەن کەئیمساڵ
دەبمەحەفتا وپێنج ساڵ
ئێستاش ئەم کارە رۆژلەرۆژێ
پتر درێژە دەدەم.

- چ پەیامێکتان بۆ
وەرگێرانی تازەلاو هەیە؟

تەنیا ئەوەندە دەڵێم
غەیان نەبن وشەی "غەیان"کە
هیوادارم وشەیەکی دزێونەبێ
لەدوو بارەوە دەبێ باسی
لەسەر بکرێ.

یەکەم: خەیانەت لەمەتنی
وەرگێراودا نەکرێ. ئەوە زۆر
هاسانە وهەموو دەیزانن.یانی
وەرگێردەبێ ئەوکتێبەی کە
دەیەوێ کاری لەسەر بکا
بەوردی موتاڵابکا و بزانێ
نووسەر چی دەوێ وچ پەیامێکی
لەو نووسراوەدا داوە بە
خوێنەر .ئەودەم نووسراوەکە
وەربگێڕێتەوە بێ ئەوەدەستی
تێوەرداو لێی زیادوکەم بکا.
جائیدی بەهەر زمانێکی
پێی خۆشەوەری بگێڕێتەوە.
هەڵبەت وەکی گوتم چەندشەرتی
بنەڕەتی دەبێ لەونێوەدا لە
بەر چاوبگیرێ.

دووەم:خەیانەت بەخوێنەرە.

یانی وەرگێر بیروڕاو
چاوەڕوانی خوێنەری لەبەر
چاونەبێ. رەنگەهەمووبزانین
دنیای پێشکەوتەی ئەمڕۆ بۆ
پێک هێنانی خۆشی وبەختەوەری
بەشەر چی دەوێ!

ئەمڕۆ ئەسڵی ئازادی
تاک وکۆمەڵ لەباری فکرو
بیروڕا وزمان وقەڵەم
وتەنەوەی بیری رزگاریخوازی
ئاواتی هەمووئەوخوێنەرانەیە
کە دەیانەوێ سەرەدەرلەکاری
نیزامی نوێی پێشکەوتە
وبیروڕای نوێی دونیای رۆژ
ئاوا دەربکەن.

وەرگێرێکی ئەم ویستانەی
خوێنەری لەبەر چاو نەبێ
وشتێک بۆ وەرگێرانی
هەڵبژێرێ کەئەومەبەستانەی
باسمان کرد تێیدا بەدی نەکرێ
لەبەر چاوی خوێنەر بەغەیان
دەناسرێ.

وەرگێر دەبێ بیری روون
بوونەوەی خەڵکی لەمێشکدا بێ.
پارێزگاری لە عەداڵەتی کۆمە
- ڵایەتی بکا دەنا خەیانەتی
بەخوێنەرو زەینی خوێنەر
کردووە.

بەکورتی وەرگێرەلاوەکان
دەبێ هەم وەفایان سەبارەت
بەونووسراوە هەبێ کەوەری
دەگێڕنەوە هەم پاراستنی
ئەمانەتی تەرجەمەیان
لەبەر چاوبێ وهەملەرێنوێنی
بەرەی لاو بۆناسینی ژیانی
تاکی وکۆمەڵایەتی دەورێکی
بەرچاویان هەبێ.

بەڵام شەرتی بنەڕەتی
ئەمانەت ئەوەیە کەوەرگێر
بۆخۆشی هەستی ئینسانەتی
و مرۆوایەتی تێدابێ وهەمیشە
لەکاری خۆیدا بەشوێن نەتەوەی
وگەشەی ئینسانەتیدا بێ.

چون ئەگەربۆخۆی ئوسوو-
لێکی لەبەرچاو نەبێ رەنگە
کتێبێک بۆ وەرگێران هەڵبژێرێ
کەلەگەڵ ئەم مەبەستانەی
باسمان کرد دژایەتی هەبێ
یا مەبەستی ئەوپارەبێ کەلە
ناشرەکانی وەردەگرێ، وەها
وەرگێرێک کارەکەشی باش بێ
دەروەستنیە.

# گۆران

هەرچەز ئەکەم ئەوخەیاڵەی پێی مەستم
بۆم ناخرێتە ناو چوارچێوەی هەڵبەستم
لێک دانەوەی دەروون قسەی زمانم
بۆچی وەها دوورن لە یەک نازانم
ئەمویست دەروون بکرایەوە وەک تۆمار
دەرکەوتایە دنیای جوانتر لە بەهار
دەرکەوتایە ئاوات هیوا خەوبینین
پڕشنگدارتر لە ئەستێرەی قوبەی شین
دەرکەوتایە مانای مەنگی دەریایی
کەنەرمە بالەرووی ئەدا بەسپایی
دەرکەوتایە ئەودونیایە کەشیعری
بی فرمێسکە وزۆرتر لە فرمێسک ئەگری
زەردە خەنەی بێ ئاوێنەی دەم وچاو
تیشکێک ئەدا روونا کترە لە هەتاو
بەلام ئەفسووس کەئەوشیعرە جوانانە
بالدا رێکن جێ ناهێڵن هێلانە
لەناوەوە ئەجریوێنن ئەخوێنن
هەرگیز قەڵەم بەکاغەزا ناهێنن

# ڕێبازی ژین

## نووری شێخ سالح

لەناو شەپۆلی غەماسەرنگوون وبی ئارام
بەکێوی سەختی ژیانا بەپێ،بەچنگەڕنی
خەریکی هەڵمەتی سەرکەوتنە بگاتەسەری
لەپڕنشێوی کولۆلی بواری لێ ئەتەنێ
بەداوی یە ئس وئەلەم ،تاروپۆی لەئێش وزام

* * *

زەبوونورێ هەڵەبووی دەشتی چۆڵ وهۆلی ژیان
شکستە باڵ وشپرزەی پلاری دەستی قەدەر
کەسێ نیە کەلەلاوە دەسی بداتە دەسی
یەکێ نیە خەفەتی خۆی لەلابدا بەهەوا
بەلایە کابیەوێ لابدا نیە رەهبەر

* * *

لەبەردە مێوە تەم ومژ بەسوورەتێکی وەها
هەتاکوو چاو بڕئەکا توندو تاروبیماوەر
ئەدا بەلایەوە بۆی دێتە پێکەنین پەگەمە
هەوڵ ئەدا کەبچێ بیگرێ ولەرێی لادا ،
چلۆن ئەگیرێ تەم ومژ بەناتەوانی وەها

* * *

ئەمانە : ئەم تەمەئەم کێوە ئەم شەپۆلە یەکی
نموونەیەکی هیوان ولەرێگەدایە بەبار
کەچاوێ پێی ئەگەوێ بۆی ئەچێ بەئیستعجال
بەلام هیلاکیە ، ئەمما ژیانی ئادەمیزاد
بەتەنگەوە نیە ، راهاتووە لەگەڵ ئیهمال
هەتاکوو ئەودەمە ئەینێنە گۆڕی تیرەوتار

* * *

١٩٢١/٥/٢٨

## مەلای جزیری

کەس ب دادا مەنەپرست گلەودا دێ چکەت ؟
تەنەبت دا درەسەک بێهوودەفەریا دێ چکەت ؟

ب شرینیێ نەگەهەت دەست ئەگەر رۆستەم بت
دێ ب بازوو وملان شوبهەتی فەرها دێ چکەت ؟

فاعیلەک لازمە دا فێعل وئەسەر پەیدا بت
گەرتو حەددا د نەبت کوورەیێ حەددا دێ چکەت؟

مومکینەک دێ هەبتن داکو تەلەب حاسل بت
سەید ونێچیر کونەبت توولەیێ سەیا دێ چکەت؟

هەرگل وسەنگ دبتن زێڕ ب تەدبیرێ حەکیم
قابیلییەت کونەبت حیکمەتێ ئوستا دێ چکەت ؟

کان ب گەوهەرچبکەت گەوهەر ئەگەرپاک نەبت
توبەسیرەت تەنەبت سیرەتێ ئەجدا دێ چکەت؟

زێڕوزیوەردکرن جەلبێ قولووبان ؟حاشا :
حوسن وسوڕزاتی نەبت قامەتێ مەییا دێ چکەت؟

عاشقێ مەست ب عێشقێ نییە حاجەت ب مەیێ
واردێ واردی ئەحوال ب ئەورا دێ چکەت ؟

تەغەرەز ڤێک کەتنا یەکوەلی یەک مورشدبت
سالیک وتالبێ ئیرشاد ب بەغدا دێ چکەت ؟

جەهدە وسەعی وتەلەب بێ ئەسەرەک سافیەنەهن
تونەبی پەردەنشین چاکەر وقەووا دێ چکەت؟

چ ئەسەر دێ ل بەرێ خارە بکەت قەترەیێ ئاب
قەلەمێ مە ب دوسێ قەترەیێ زوهها دێ چکەت ؟

دێ ژحەق جازیبەیەک دل بگرت وەرنە " مەلا"
ژ ئەزەل گەرتوهیدا یەت نەبت ئیرشادێ چکەت؟

## حاجی قادری کۆیی

تا سالیکی مەسالیکی مولکی قەناعەتی
باکت نەبێ لە رێگر و ئەهلی شەقاوەتی

سۆفی عیبادەتی هەموو بۆ مەکر و رێوەیە
گەر شێری نەڕ بەگوێ بگرێ پەشمە تاعەتی

ئیخلاسە ئەسلی مەقسەد و خوڕا شەقی دەبێ
وا تێدەگا بەسەرمەقولاتە سەعادەتی

بێ مەعریفەت مەبە لە تەریقی حەقیقەتا
سەر مەنزیلی شەریعەتە جێگەی سەلامەتی

مەفهوومی دوو حەدیسی سەحیحم لە بەیتەکا
جێ کردەوە نەزەر بکە کوردی و فەساحەتی

دونیا سەگی لە ئۆغلەمە تۆقیوە تالیبی
نەیماوە هەر وەکوو سەگی پێ سووتوو راحەتی

سەدقوببەیی خەوەرنەق و سەددی سکەندەری
ناگاتە بەیتە کاولی ( نالی) و مەتانەتی

ساقی کەریمە ، بادەیی بەزمی ئەلەستی یە
(حاجی) لە جامی قەلبی شکاوە شکایەتی

## سەیدی

هامسەران ئێشان ، هامسەران ئێشان
ئی شەوزامی تەن،خاس مەدان ئێشان

مەلوول وزویر ، خاتر پەرێشان
چمان قیمەی جەرگ ، ئەمن مەکێشان

کەس نیەن پەرسۆ ، ئی زامدارەکێن ؟
ئی بەندەی بەدبەخت ،سیا ستارەکێن ؟

پەی رووی رەزای حەق ،فیکرێ جەحاڵم
بانە گیرۆ عام، هەناسەی کاڵم

ئەرزامان بەی تەور ،تاسوب کەران چڵ
سوب لاشەی (سەیدی) ،مەسپاران بە گڵ

ئەحمەد بەحری

# روانینێک لە دمدم

ئێمرۆ کەلاپەڕەی مێژووی گەلان بەتایبەت گەلی ئێران هەڵدەدەینەوە ، دەبینین کە زۆر کارەساتی بەسامودڵتەزێن وپشتچەمێنی بەخۆوە دیوە . . هەر سەردەمەی بەرەوی شایەک بووە . هەتا ئەوجێیەی تیغیان بڕیویە . لەقەلاچۆکردنی خەڵک خۆیان نەبواردووە .ئەوانەی کە هاتوون وحوکمیان بەدەستەوە گرتووە ،زەبروزەنگی تایبەتی خۆیان نواندووە. تالان و بڕۆیان پەرە پێداوە ! بۆچاو ترسین کردنی خەڵک شاریان بە کۆمەڵ قڕکردووە ! لەهێندێک ناوچە نێرینەیان لە وڵات بڕیوە ! هێندێکیان بە هەزار هەزار چاویان دەرێناوە ! لە کەللەسەران منارەیان ساز کردووە ! خەڵکیان لە بارستە خیزان گرتووە و لە سەریان داون ! هێندێکیان تەنانەت روحمیان بە سەگو پشیلەش دا نەهاتووە ! بەڵێ،لاپەڕەکانی مێژوو پڕن لەو زاڵمو لەخوا نەترسانە .لەچەنگیزوتەیموور را بگرە هەتا ئاغا محەممەد خان وشای گۆڕبەگۆڕ ،هەموویان لەو قوماشە بوون .

"شا عەبباس" ئەگەر لەوانە خوێن رێژتر و بێ روحمتر نەبووبێ کەمتریش نەبووە . کارەساتە بەسامەکانی وەک پینەی رەش بەسەر لاپەڕەی مێژوودا ، لە دوورەوە خۆ دەنوێنن .ئەو شا زاڵم و لە ئیسلام تەرێک بووە ، لەقەلاچۆ کردنی خەڵکدا دەستێکی باڵای هەبووە . هەرکەس سەری دڵی هەڵاویشتووە سەری لە عەرزی خستووە . ئەوەی لەلای ئەو قەدر وبایەخی نەبووە ،گیان و ماڵی نەتەوەی ئێران بووە . "موکری قڕان""ەکەی بەناو ـ بانگە بەیت وبەسەرهاتی دمدم کە وەک لاپەڕەیەکی زێڕین لە مێژووی گەلەکەماندا دەدرەوشێتەوە ، لە زەمانی حوکماتی ئەوشایەدا روویداوە سالی ١٠١٨ ی کوچی ئەگەر یەکێک لە بەرچاوترین و خوێناوی ترین بەربەرەکانیەـ کانی نەتەوەکەمان لەبەرانبەر ستەمکارانی مێژوودایە ، هەر لەو حاڵەشدا یەکێک لە دڵتەزێن ترین بەیتەکانە .

کەم کەسم دیوە بە بیستنی ئەو بەیتە فرمێسک لەچاوی دا گۆمیلکەی نەبستبێ . کزەی لە جەرگ وهەناوان نەهاتبێ . ئاوری بۆ گەمارۆدراوانی تێنو تێبەر نەبوونی هەر وەها سەبارەت بەدڵ رەقی و خووی

خوێن ڕێژانی گەماروەدەر
موچوڕکی بە لەشدا نەهاتبێ
و مووی قرژنەبووبن‌کەم کەسم
دیوە قارەمانەتی خانی لەپ
زێڕین شوێنی دانەنابێتە سەرو
لە دڵدا ئافەریمی پێ
نەکوتبێ، هەروەها شانازی
بەو ڕۆڵە نەمرە نەکردبێ.

ئێمە لێرەدا مەبەستمان
شی کردنەوەی بەیتی دمدم لە
باری ئەدەبی، کۆمەڵایەتی،
ئابووری و...نیە. هیوادارم
لێزانان وچازانان بۆ ئەو
بابەتە قۆڵ هەڵماڵن. نەک
بەیتی دمدم ،بەڵکووبەیتەکانی
دیکەش شی کەنەوە وبەشێوەی
عیلمی لێیان بدوێن. ئەوەی
لێرەدا دەیخەینە بەرچاو
ئەفسانەیەکەسەبارەت بە
چۆنیەتی‌دروست‌بوونی قەڵای
دمدم ویدەچێ هێندێک
ڕەخنەمان لێ بگرن وبڵێین :
"دەی جا ڕوودا وێک کە شوێن و
کات وقارەمانەکانی ڕوون و
ئاشکران،ئیدی ئەفسانە بۆ!؟"
ڕەنگە ڕەخنەکەیان ڕاست بێ.
بەڵام بۆنەتەوەیەکی کەمێژووی
نەنووسراوەتەوە لەرابردوودا
دیواری پۆڵایینی بە دەوری دا
کێشرا بوو. دوژمنان کونی
ئاودەڵێنیشیان لێ بریبوو.
تەنانەت‌نەیاندەهێشت لە
کوولەکەشدا بانگ بدا، چی
هەیە بە چاوی خۆیەوە بنێ؟
کێێ هەیە باوەڕی پێ بکا؟
کەوابوو پەنابردن بۆئەفسا-
نەش ڕێیەکە بۆ دوزینەوەی
بزربووەکانمان. ئاخر زێر
دەقوڕیش دابێ دەتروسکێ.

ئاقڵمەندی خان، بەردی خر
ولێوەبر، چەرمە گا، کوڕنی
ژنانی قەڵا، حەمەدبەگ وئاکاری
هەوای بەردی دوندی........
هەموویان جێی ئەوەن کە بە
وردی بیریان لێ بکەینەوە و
مووی سپی لەماست دەرکێشین

ئەگەرچی جارجار مێژوو
نووسانی چاو لەمست نووکی
قەڵەمیان بۆلای ئێمە خوار
بۆتەوە! بەڵام نە توانیویانە
لەخەت لادەن. نەویستووشیانە
خۆڵ لە دۆی خۆیان بکەن.
ریشەی زوربەی بەیتەکان بە
ڕووباری مێژووی گەلەکەمان
ئاودراون و لک و پۆیان
دەرکردووە. هەر بۆیە دەبێ
نانێکی بخۆین ونیوەی بکەینە
خێر، بۆ ئەوکەسانەی بەیتیان
بۆ گوتووین. سینگ بە سینگ
بۆیان پاراستووین، وەک
گەوهەرێکی بێ غەل ر غەش
پێیان ئەسپاردووین. ئێمە
وەکوو کوردێک دەبێ شانازی
بەوەی بکەین کەخاوەنی دوڕی
عەنتیکەی وەک بەیتین.
بەڵام ئەفسانەکە :

**خان پیاوێکی زۆرتێگەیشتو و ئازا بوو. لە شەڕدا وەک بەوری بەیان هەڵیدەکوتایە سەر دوژمن. سەری بۆکەم‌کەس دادەنواند. زۆر کارامە و لێزان بوو. دۆستان شانازیان پێ دەکرد، دوژمنان ئێرەیان پێ دەبرد. لە شەڕێکیدا کەلە قەفقاس ڕووی دا ،لەخوبردوو- یەکی بێ وێنەی نواند.هەرلەو شەڕەدا بوو کە قۆڵێکی لەدەست‌دا. شاعەبباس بەهۆی ئەو لەخۆبردویەی خان، هەر وەها بەهۆی نێوبەدەرەوەبوونی دەستووری دا بەزێڕینگەران قۆڵێکیان لەزێڕ بۆساز کرد. لەوێ ڕۆژێ را بە خانی لەپ زێڕین نێوبانگی دەرکرد.**

**ساڵێکی خان لە چیمەنی هۆزانێ هەڵیدابوو.گاوانێکی دەبێ ئەوکابرایە هیچ ڕۆژێکی نابێ کە گارانی بەوەختی خۆی بێنێتەوە! جاری وا دەبوو ڕۆژ ڕەمبێکی دەما گاڕان بەبێ گاوان بەنێو ماڵان وەردەبوو! جاری واش دەبوو هەتا ماڵ نووستنانیش خەڵک دەبا چاوەنوار مابانەوە! چونکە ئەوکارە ماوەیەک بەردەوام، دەبێ سکاڵایە دەبەنە بەر خان. خان گاوان تەڵەب‌دەکا و هۆی ئەو کەمتەرخەمیەی لێ دەپرسێ.گاوان وڵام دەداتەوە:**

**"ئەی خان ئەمن تەقسیرکار نیم. لەسەر دوندی ئەو کێوە بەردێکی پانی لێیە. هەموو ڕۆژێ کە گارانێ دەبەمە بەندەنێ، تێ هەڵدەگەرێم دەچمە سەر ئەو بەردە. هەرکە چوومە سەرێ، هەوایەک‌دێتە کەللەمەوە،ئاگام لە دنیایە دەبڕێ ،وەنازانم دەوری چ پاشایەکییە! گفتم ڕەوان‌دەبێ دۆست‌وخزمان کۆ دەبینم،گرێم لەدڵ دەبڕێ .سەری نەیاران‌لە**

ژێرپێی خۆمدا دەبینم. ئیتر نە گاوانیم لەبیر دەمێنێ و نە گاران."

خان ئەوێ شەوێ هەتا ڕۆژ بۆوە خەوی لە چاوی نەکەوت. هەرکە گزینگی هەتاو لەدوندی چیا بەرزو گەردەنکەشەکانەوە مزگێنی بەیانی بۆدا نیشتووانی چیمەنی هۆزان هێنا. خان پیاوی ماقوڵ و ردێن سپی لەگەڵ خۆی خست. ڕووی کردە ئەو چیایەی کە گاوان لێی دوابوو. هەر وەکە گاوان کوتبووی تاتە بەردێکی گەورەی لێ بوو. بۆ ڕاست و دروستی قسەی گاوان پیاوێکی خۆی ناردە سەر. هەربەو چەشنە کە گاوان کوتبووی، هێندەی پێ نەچوو حاڵی گۆڕا دەستی کرد بە دەستووردان وفەرمان دان. قسەی وای کرد کەهەرگیز لێیان نەبیستبوو! ئەوی هێنا خوار یەکی دیکەی ناردە سەر. ئەویش هەر بەو چەشنە دەستی کرد بەقسەی سەیر، سەیر خان بڕیاری دا بۆخۆی وەسەر کەوێ. پێی کوتن:

"ئەمن ئەوە دەچمە سەر لێم گەڕێن با هەوایەکم بێتە لە کەللەیەوە. بەڵام پێش ئەوەی حاڵم بگۆڕێ بمهێننە خوار... خان چووە سەر هەر وەک بۆخۆی کوتبووی پێش ئەوەی حاڵی بگۆڕێ هێنایانە خوار.

دوای ئەو ڕووداوە خان کۆڕێکی بەست. پێشنیاری کرد کە لەو جییە قەڵایەک سازکەن. پیاوی ماقوول وردین سپی ئەو پێشنیارەیان پەسند کرد. بەڵام کوتیان:

"حەستەمە شاعەبباس ئیزنی شتێکی ئەوتۆمان پێ بدا دڵنیاین کە بەرهەڵستیمان دەکا. خان کوتی:

"داوای دنیایەکی لێ ناکەم تەنیا جێی چەرمەگایەکم لێ دەوێ."

هەر لەسەر ئەوبڕیارە نامە ـ یەکی بۆ شا نارد. داوای لێ کرد لەووڵاتە زۆرو زەوەندەدا جێ چەرمە گایەکی بداتێ! شا سەری لەو کارە سوڕما، کوتی:

"جابۆ جێی چەرمە گایەک؟! ئەوە ئەمنیش دامێ، جێ چەرمە گایەکی چ لێ دەکا!؟ بۆئەوەی کە دڵی خانی نەشکاندبێ. هەر وەها چوونکە پێی شتێکی زۆر گرینگ نەبوو. وڵامی بۆناردەوە:

"ئەوە جێ چەرمەگایەکم دایەێ."

خان هەرکە ئەو وڵامەی بۆهاتەوە دەستوری دا گایەکی زەلامیان لە عەرزیدا، کەوڵیان کرد و چەرمەکەیان ڕاهێنا. تەنانەت لە داوە دەزوشیان باریکتر لێ کرد. ئەو هەودایەیان لە دوندی کێوەکە وەڕێنا! شوورەی دیواری قەڵایان لەسەر هەودای چەرمە گا دامەزراند. دەستیان کرد بە دانانی قەڵایەکی یەکجار قایم وپتەو. کانییەک لە سەرەوەی قەڵا بوو. ئاوی ئەویان بۆ قەڵایە کێشا و سەریان داپۆشی. بێجگە لە دانیشتوانی قەڵا هیچ کەس لەو ڕازە خەبەردار نەبوو. بۆ ئەوەی ڕازی قەڵا بڵاونەبێتەوە خان دەستوری دابوو هیچ کەس حەقی نیە لە قەڵا وەدەرکەوێ.

لەلایەکی دیکەوە گزیکاران و دوژمنانی خان، بەردەوام بە گوێی شایاندا دەخوێندکە خان جێی مەتمانە نیە، بە هێندت ناگرێ، بە هەویای سەربزێوی یە. هێندەیان لەبەر خوێند هەتا خوت خوتەیان خستە دڵیەوە. شا بۆوەی کە لەنیەتی خان ئاگادار بێ، پیاوێکی خۆی بەدزی ناردە قەڵا. پیاوە هات و بوو بە کرێکاری بەردەستی یەکێک لە وەستاکانی قەڵا. نیزیک بە مانگێک لەوێ ماوە، دوای هەڵسەنگاندنی شوێن وچۆنیەتی قەڵا، لە دەرفەتێکدا وەدەر کەوت. بە سەر ڕەو خۆی گەیاندەوە خزمەتشای. لە چۆنیەتی قەڵا وبیروباوەڕی خان ئاگاداری کرد.

هێندەی پێ نەچوو شا لەشکرێکی یەکجار قورسی هێنا سەر قەڵا چەند مانگان حەولی دا بۆی نەگیرا. بە دەستووری خان خۆڵەپۆتین یان بە بەر دەرکی دەروازەی قەڵا وەرکردبوو، دار کێلەیان لێ دابوو.. هەر کەس بەسەری دا ڕۆیبا شوێنی دیاری دەکرد.

دەڵێن شەوێکی حەمەدبەگی لێتان" ناڵی ئەسپی بەرئاوەژو

لێدا ، بەدزی لەقەڵاوەدەرکەوت
و خۆی تەسلیمی لەشکری شا ی
کرد ! پێی کوتن : " حەول و
تەقەلای ئێوەبێهوودەیە .تەنیا
ڕێگای گیرانی قەڵا ، گرتنی
سەرچاوەی ئاوی قەڵایە . ئەمن
حازرم پێتان شان دەم "وەپێش
لەشکری کەوت ،یەک ڕاست
بردنیە سەر کانیەکە . سەریان
داوە وئاوەکەیان هەڵبڕی.بێ
ئاوی وردە وردە تەنگی بە
دانیشتوانی قەڵا هەڵچنی.
مەجبور بوون بەدەستێوە دەن.

دەڵێن پاشگیران و قەڵاچۆ
کردنی دانیشتوانی قەڵا،پیاوی
شای کە لەمەوبەر مانگێک لە
قەڵادا کاری کردبوو. بانگی
حەمەد بەگی دەکا ولێی دەپرسێ
هۆی هاتنی تۆ بۆنێو لەشکری
چ بوو؟ چۆن بووکە سەرچاوەی
ئاوی قەڵاکەت پێشان داین ؟
حەمەد بەگ دەڵێ :

" دانەلغاوی ئەسپم لەزێڕ
بوو،داوام لێ کردن نالێ
ئەسپیشم لەزێڕی ساز کەن .
بەڵام بە قسەیان نەکردم
کوتیان : "جاری وەختی نیە"
ئەمنیش لە دڵم گران هات
بۆیە بەجێم هێشتن ." کابرا
پێی دەڵێ : " ئەمن مانگێکم
لەو قەڵایە کار کردووە . بە
سەرچاوەی ئاوەکەشم دەزانی .
بەڵام چوونکی نان و نەکم
کردبوون باسم نەکرد. ئەتۆی
کە وەفاتبۆ وان ئاوا بێ بۆ
ئێمە چۆن دەبێ ؟ واچاکە لە
سەر ڕووی دنیایە نەمێنی..
دەستووری دا گۆشا و گۆش
سەریان بڕی .

* * *

دمدمم بەردێکی زۆپە
لێیان داتۆپخانەوتۆپە

* * *

دمدمم بەردی لەنزاری
لێیان داتۆپی هەوشاری
جەوتشەووڕۆژان ئاوردەباری
دونیای داگرت بەیەکجاری
خەبەر چوولەبۆهەوشاری

* * *

دمدمم بەردێکی دەبەیە
لێی دەدەن بەتۆپی کەلەیە
کاریتەی گەیبە کۆکەیە
دمدمم بەردی مەیدانێ
لێی دەن تۆپی لەکارخانێ
کاریتەی گەیە هۆزانی

* * *

خانێک رابوولە کوردانە
کێ بوولەحەمەدبەگی لێتانە
ڕووی ڕەش بێ دەگەڵ جووانە
لەسەریەک نیمچوون ناڵانە
زیزبوو چووبۆنێو ئەوانە
پێی نیشان دان سوولەخانە

دمدمم بەردی لەبەردی
لێی دەدەن بەتۆپی نەبەردی
تارۆژی مەردی ونامەردی

* * *

دمدمم بەردی مەیدانێ
لێی دەن تۆپی ئیسفەهانێ
تۆزگرتی بەری ئاسمانێ
مەرد چاکتێدا دەگرن مانێ
بۆڕۆژی ئاخر زەمانێ

* * *

دمدمم بەردێکی شینە
چوار زستان وپێنج هاوینە
تێیدا خانی لەپ زێڕینە
زەفەریان پێ نەبردینە

* * *

دمدمم بەردێکی پانە
لێیان داتۆپ وتۆپخانە
قەڵاتی پێ بکەن وێرانە

* * *

# جوغرافیای شنۆ

مارف ئاغایی

بەشی یەکەم

شاری شنۆ لەجەنووبی ورمێ لە باکووری رۆژئاوای شاری نەغەدە هەڵکەوتووە. مام، ناوەندی بەرزایی ۱۴۷۰ میترە و بەرزترین جێگای لەباکووری رۆژئاوا ۳۵۰۰ میترە.

لە عەرزی جوغرافیایی ۳۸° دەرەجە و ۲ دەقیقە و۳۰ سانیە و لە توولی جوغرافیایی ۴۵ دەرەجە و ۶ دەقیقە دایە و ئیختلافی سەعاتی لەگەڵ شاری تاران بیست دەقیقەودوازدە ، سانیەیە

شنۆ شارێکی چکۆلەی پڕ لە جوانی یە. چۆمێکی گەورە بە نێوەڕاستی شاردا تێدەپەڕێ و دیمەنێکی تایبەتی داوەتێ و شاری دووبەش کردووە. بەشێکی شار لە لای شومالی ئەو چۆمە دایە کە ماڵەکانی زۆربەیان بە چەشنی قەدیمی ساز کراون و بڵێند ونەوی یان زۆرە و تەنانەت لە زۆر جێگایان وەتەپۆلکان کەوتوون. ئەو گەڕەکانە کۆنترین بەشی شارن بەشی دیکەی شار لەدەشتایدا هەڵکەوتووە وزۆربەی خانووە-کانی بە سمیت و خشت چاکراون وبەئاسن داپۆشراون جوانی باغەکانی پڕ لەسەوزەو گوڵ و میوەی خۆشی وەکوو گێلاس سرنجی زۆر رێبوار و گەڕیدەی وەک ابن حوقل حەمدوڵڵا مستەوفی و یاقوت حموی و... بۆ لای خۆی راکێشاوە وشنۆی کردۆتە گوڵی باغی کوردستان.

جوغرافیای مێژوویی

۱ـ ناوی شاری شنۆ لە پێشوودا (اُشنو) بووە کە لە زمانی کەلدانی قەدیمدا (عشنو شنۆ ،ئەشنۆ) بەمانای (قەڵا،دژ بورج ،مەتەرێز، دیوار) کە عشنو لە بەردی کێلەشیدا بە خەتی میخی هەڵکەندراوە.

۲ـ شنۆ لە پێشوودا "اُشنە" بووە کە بە مانای گیایەکی بۆن خۆشە وبەفارسی بەوگیایە دەڵێن "دوالە" کە لە داری گوێز وسنەوبەر داڵێ و لە کەتیبەی کۆرشدا لەئەیالەتی (اُشنوناک) ناوبردراوە کە هەمان "اُشنو"یە وگۆیا باجیان داوەتە کۆرش.

۳ـ لە مێژووی پەیدابوونی شاری شنۆ بەڵگەیەکی قایمان لەدەستدا نیە بەڵام ئاسەواری مێژوویی وەدەستهاتوو لە تەپکی دەنخەدا دەردەکەوێ کە لە زەمانی پێشوودا لەو ناوچەیە قەومی ئاشووردەژیان. بەڵام ئەو قەومە بە هۆی رووداوی مێژوویی لەناوچوون و ئەوانەی کەزیندوو ماون لەو ناوچەیەوە دەرکەوتوون هەتا زەمانی سەفەوی لە چۆنەتی شار زانستێکی ئەوتۆ بەدەست نەهاتووە. بەڵام لە هەوڵەکانی سەردەمی دەسەڵاتی سەفەویدا قەومەکانی ئەرمەنی بەهۆی هێرش وئازاری لەشکری عوسمانی پەڕیوەوئاوارە بوون و بەهۆی لایەنگری دەوڵەتی ئەو کاتی ئێران لە شیمالی غەربی ئێران نیشتەجێ بوون بەڵکوو ئەوان شاری شنۆیان پێک هێنابێ. ناوی شنۆ (اشنو اشنە ،یا شنود) بووە کە لە قامووسی ئەرمەنی دا بەمانای لێوی دەرەیە. و ئەوەی کە قەدیمیترین بەشەکانی شار لە

لای شیمال (باکوور) و لە لێوی دەریادایە خۆی بەڵگەیە کە بۆ پێک هاتنی شار بە دەستی ئەرمەنی یان لەپاش بێ هێز بوونی دەوڵەتی سەفەوی و بە تایبەت لە کاتی دەسەڵاتی ئەفغانەکان لە ئێران بەهۆی ناکۆکی زۆر وهەرج ومەرجی وڵات و هێرشی قەومەکانی کورد و تورک ئەرمەنی یەکانی نیشتەجێ لەو شارە ناعیلاج بوون بچنە شاری ورمێ و ناوچەکانی دەوروبەر و لە جێگای وان قەومەکانی کورد وردە وردە لەو ناوچەیە دامەزران هەتاکوو لە ساڵی

١٢٤٥ هـ.ق (١٨٦٥میلادی) لە سەروبەندی شەڕی نێوان ئێران و رووس ناوچەی شنۆ بۆ ژیان درا بە تایفەی زەرزا. لەپاش ناکۆکی و شەڕ لەو ناوچەیەدا لە ساڵی (١٢٨٠هـ.ق) تایفەی زەرزا لە بەخشەکانی رندۆڵە بابۆڵە و شەترە لە ناوچەی سنووری نێوان ئێران وعێراقدا

نیشتەجێ بوون و دەستەیەک بە ناوی تایفەی مامەش لە شاری شنۆ جێگر بوون. کە لەپێشدا گەڕەکەکانی شومالی رووباری شنۆیان پێک هێنا و لە پاشان بە هاتنی تایفەی زەرزا و هێندویەهودی یەکان و گەورە بوونی شار گەڕەکی کەرخۆر، هیندووەکان و یەهودی یەکان پێک هاتن. بۆ ئەوەی کە یەهودی یەکان کەنگێ هاتووـ نەتە شاری شنۆ بەڵگەیەکی پتەومان لەدەستدا نیە بەڵام ئەو یەهودی یانە هەتا پێش حکوومەتی ئیسرائیل لە شاری شنۆ بە ژمارە پلاکی ٥٤١ ، کەنشتیان لەناو شاری شنۆدا بووە کە پاش ماوەیەک ئەو جێگایەیان لێ ستاندوونەوە لە گەڕەکی جووان کەنشتێکی دیکەـ یان بەژمارە پلاکی ٥٤٨ ساز کردووە و لەساڵی ١٣٣٢ (ک. هـ) بەرامبەری ساڵی١٩٥٣ی میلادی و پاش دامەزرانی حکوومەتی ئیسرائیل چوونەوە وڵاتی

داگیرکراوی فەلەستین و هەروەها هیندووەکانیش تەنیا هێندێکیان لەو شارە بنەگر بوون و زۆربەی ئەفرادی هۆزەکە چوونە ناوچەی سنووری ئێران و عێراق لەساڵی ١٣١٩ (ک.هـ)دا ئەرتەشی شووڕەوی (لە شەڕی دووهەمی جیهانیدا) هاتە شنۆ.

٤ـ گویا سێزدە قەرن پێش میلادی مەسیح شنۆ شارێکی زۆر گەورە و ئاوەدان بووە کە نێزیک بە چوارسەدهەزار کەسی (بە گوندەکانەوە) دانیشتوو بووە و چوار دەروازەی بووە کە هەرکامەی بە چەشنێ قەڵا و دژێکی قایم لە چوارلای شار دانراوە یەکەم: ١ـ دەرواـ زەی قەڵا تۆک کە لە شومالی غەربی شاردا ئێستاش ئاسەواری ماوە و دەریاچەی قەڵا تۆک یا کێوی زمە لە کن وێ بووە ٢.ـ گوندی ئاسناوێ کە لە سێ کیلۆمیتری جەنووبی شار لەسەر تەپکۆڵەیەک داندراوە.

٣ـ گردکاشان لەشومالی شەرقی یا باکووری رۆژهەڵاتی شنۆدا لەسەر تەپکێک چاکراوە.

٤ـ رکاباد کە لە سەرەوەی جادەی شنۆـ نەغەدەیە.

هێندێک پێ یان وایە کە شنۆ بەهۆی لەوێ بوونی مەلەکەی سەبا بەناوی شاری سەبا ناوبانگی دەرخستووە بەڵام بەداخەوە هیچ بەڵگەیەکم لەو بارەوە دەست نەکەوت.

ناوی شاری شنۆ بە ناوی

شمال

دهستان دشت بیل

نلیوان

گندویلا

اشنویه

جبرائیل آباد

دهستان اشنویه

عشنو لە بەردی کێلەشین دا بە خەتی میخی هەڵکەندراوە . ئەو بەردە ٩٠٠(نۆسەد) ساڵ پێش دانانی تەختی جەمشید لە سنووری نێوان ئاشوور وولاتی ئوراتوور (ئەرمەنستان) دیاری کراوە و مەسیحی یەت لەسەدەی پێنجەمی میلادی لە کوردستان تەنەوەی کردووە و شاری شنۆ بۆتە جێگای ژیانی ئۆسقۆفەکا ـ نی گەورەی نەساری هەروەکوو لە کتێبی مێژوویی "مارآبادا" هاتووە . ناوی ئۆسقۆفی گەورە ماردنخا بووە کە کلیسایەکی گەورەی داناوە وپردەکانی شار بە فەرمانی ئەو ساز کراون ئێستاش "دیرمارابراهم" دارولعولەمای مەسیحی بە چەشنێکی خرابوو ماوەتەوە ، لەپاش کوشت وکوشتارێکی زۆری نەساری یان مەجبوور بوونەلە شنۆرا بچنە شاری نەغەدە ولە ساڵی ١٩١٨ ی میلادی لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا مەسیحی یەت و نەساری لەو ناوچەیە لەنێو چوون . دووهەزاروپێنسەد (٢٥٠٠) ساڵ لەمەوبەر بوومە- لەرزە شاری شنۆی هەڵتەکاند و شاری بەتەواوی خراپ کردو زەرەرێکی زۆری گیانی ومالی لە خەڵکدا لە پاشان وادەرکەوت کە ئەوبوولەرزەیە بەهۆی ئاتەشفشانی کێوی ڕەندۆڵە بووە .

لەساڵی ١٩٠٩دا عوسمانی- یەکان شاری شنۆیان گرتەوە و زۆریان خەڵک کوشت وشەڕی نێوان عوسمانی و رووس ، زیانێکی زۆری لە خەڵک دا لەپاش رووسەکان نۆبەی (ئاشووری یەکان) گەیشت کە هێرشێکی بەربڵاویان بۆ شار هێنا وبەزەیی یان بە ژن و منالیش دا نەهات و لە پاش ئەو شەڕە گرانی پەیدا بوو . پاش مردن و لەنێو چوونی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵک ئەوانی کە مابوون رایان کرد بۆ شارەکانی دیکەوژمارەیە- کیشیان چوونە (عێراق) و بۆ لای شارەکانی کەرکووک ومووسڵ چوون کە بەهۆی سەرمای زۆرو بەفر و رنووی زستان لەسێزدە هەزار کەس خەڵکی شنۆ تەنیا چەندسەد کەس زیندوو مانەوە

کەمترین دەرەجەی گەرما لەمانگی سەرماوەز (دیماه)دایە

شەو وردە ،وردە لەسەرەخۆ چارشێوی رەشی بەسەر وڵات دەکێشا . شنەبای بەهارێ لک وپۆپی دارەکانی دەلاواندەوە و بەدەنگی خۆشی لای لایە دەخەوی دەکردن . خەڵک وەک ماسی نێو دەریای بێ شەپۆل بۆ حەسانەوە و دەرکردنی ماندوویی لەش ، بەرەو ماڵ دەچوونەوە . ئەستێرەکان بە تروسکەی خۆیان ئاسمانیان جوانتر دەکرد . منیش دوای خودا حافیزی لە هاوالانم بەرەو کانگای خۆشی و شادی وەڕێ کەوتم .

خەیاڵ هەڵیگرتم نەمزانی چۆن گەیشتمەوە ماڵ لەپڕ بە دەنگی ناسک و بلاوێنی کیژۆڵە بچکۆڵەکەم کە دەیگوت : بابە گیان ، بابە گیان ،وەخۆ هاتمەوە و لە دەریای خەیالات هاتمە دەر . خۆی لەئامێزم هاویشت و بە هەڵپە وتامەزرۆیی-یەوە ئەولاو ئەولای ماچ کردم ،منیش توند لەئامێزم گرت ودەستم بە سەری دا کێشا و بەرەوماڵ وەڕێ کەوتین . لەرێگادا هەر چاوی لێدەکردم ودەیگوت : " بابە گیان زۆر جوانە !"

منیش دەمگوت : ئاخر چی جوانە رۆڵە گیان ؟

– بابە گیان با بچینەوە ژووری پێت نیشان دەدەم .

ئەوکاتەی گەیشتمەوە ماڵ بە پەلە هەڵاتە نێو وەتاغەکە وپاش ماوەیەک بەگرژی هاتە دەرو گوتی : " دایە کوا لە کوێ یە ؟ " دایکلە وەلامدا گوتی: چی رۆڵە ؟

– ئەوەی مامم بۆی هێنابووم .

– بزانە هەرلەژووری یە.

رووم لە خێزانم کردو گوتم:

-چیە ؟ ئەو کچە لە چی دەگەڕێ ؟ بۆ هەر بۆئەملا و ئەولا دەچێ ؟

خێزانم گوتی : هەر ئێستا بۆخۆی پێت دەڵێ .

لەپڕ بە دەنگی ناسکی هاواری کرد :

دیتمەوە ، دیتمەوە! بابە گیان چاوی لێکە ، مامم بۆی هێناوم .گۆواری خۆمە ، چاوی لێکە چەندە جوانە !

ئەوکاتەی لە دەستم وەرگرت دیتم راست دەکا ئی خۆی بوو ،گۆواری جوانی " سروە" بوو . بە پەلە لە دەستی فڕاندم ، لە ئامێزی خۆی گرت و گوتی :

– ئی خۆمە زۆرم خۆش دەوێ ،ناتاندەمێ .

فرمێسک بەچاومدا هاتە خوار و پێم گوت :

پیرۆزت بێ " سروە " گیان .

سەردەشت :**محەممەدپەناهی**

لەباری گوندی خۆتانەوە هەرچی دەزانی بینووسە. ئەگەر دەستەی نووسەران پەسندی کرد چاپی دەکەین.

سەردەشت :**مستەفا عەبدۆڵی**

ئێمە شناوی کاک عەولاغاڵە سوارەمان بیستووە بەڵام هیچ لەبارەی ژیانی ئەودا شارەزا ـ بیمان نیە .

ئەگەر دەتوانی بەسەرهاتەکەی بنووسە تا زوو بڵاوی بکەینەوە وخەڵکیشکەلکی لێ وەربگرێ وئەمهونەرمەندەش باشتر بناسرێ.

بۆکان:**ئیسماعیل حوسێنی زادە**

ـ ژن بەژنە درێژەی هەیە وبەرەبەرە بڵاودەکرێتەوە

ـ ئەم وشانەی لەزمانی کوردیدا (ع)ی تێدایەعەرەبین بەڵێهەمووکەس دەتوانێ هاوکاری سروەبێ وجێگەی لە سەرچاوانە .سروە هیهەموانە وبە هەموان جوان دەبێ .

مەهاباد :**فەرهادئێرانپەنا**

ـ ئەوەی دوستەیئنووسەرانی سروە لەدەستی بێ سەبارەت بە رێنوێنی خەڵک درێغی نیە بەتایبەتی شاعیران و نووسەرانی لاو،

بانە :ع. **سادقی**

هیوادارین بتوانین لە ژمارەکانی داهاتوودا ژیاننامەی مامۆستا هەژار بڵاو بکەینەوە .ئەودەم وێنەکەشی لەگەڵ چاپ دەکەین.

وێنەی خوالێخۆشبوو مامۆستاهێمن لە "کونگرەنامە" و"سروەیژمارەپێنج"داهەیە .

مەهاباد :**سولەیمان تەحریریان**

هیوادارین لەژمارەکانی داهاتوودا بتوانین بەشی وەرزشبەشێوەیەکی نوێ و پڕنێوەرۆکتر لەجاران بڵاو بکەینەوە .

سەردەشت :**محەممەدرەسوولیان**

ئەمکورتە چیرۆکەیبۆت ناردووین، کورت کراوەیکتێبی "باقەبێن" نووسراوی" قازی ئەحمەد"ە .بەڵامدووعەیبی هەیە .یەکەم ئەوە کە نەت نووسیووەلەمکتێبەت وەرگرتووە ودووەم بابەتەکەشت بەجوانی کورت نەکردۆتەوە .

هیوادارین بەرهەمی جوانترمان بۆبەرێ بکەی و ئەگەروتارێکیاکورتەچیرۆکێک ا لەجێگەیەکت وەرگرت ناوی چاوەکەی بنووسی. چون ئەوە شەرتی ئەمانەتداری ئەدەبیە.

سەردەشت :**سەلامکەریمی**

لەوەلامی پرسیارەکانتدا دەبێ بڵێین بەرلەوە کە نامەکەتبگا سروەی ژمارە، دە بەرێ کرابوو.

سەردەشت :**ئەبووبەکر**

لە بابەتساڵی پەیدا بوونی رای جۆراوجۆر هەیە. دەستەیەکزانا دەڵێن تەمەنی دونیا لە پێنج میلیۆن ساڵ تیدەپەری. لە قورئانی پیرۆزدا باسی ئەو مەسەلە نیە .

نووسینی خەت دەگەڕێتەوە سەر پێنج هەزار ساڵ پێش لەدایک بووتی مەسیح (د.خ)

نووسینی کوردی زۆرلەمێژە باوە .شیعرەکانی باباتاهیری هەمەدانی بەکوردی بوون هەر وەها لەسەرەتای پەرەگرتنی ئیسلامدا کوردی نووسین باوە بووە. بەڵام بەوشێوەکە ئێستا ئێمەپێی دەنووسین زۆر لەمێژنیە .

کورد زانای گەورەی زۆر، بووە وئێستا شنەتەوەی کورد بەهەزاران زانا و نووسەر وپیاوی گەورەی هەیە. ئێمە ناتوانین زاناترین کوردت لەرابردوودا بۆدەستنیشان بکەین.

خانێ: مراد قادری، عومەر محەممەدپوور

داواکانتان لەسەرسەران، لەسەرچاوان.

بەیتی زەمبیل فرۆش چاپ دەکەین. سروەش بووە بە مانگانە هیوادارین بەنا ردنی وتاروبابەتی جوان یارمەتیمان بدەن.

دیاری ئەم ئازیزانەشمان پێگەیشتووە سپاسیان دەکەین وبەرەبەرە لەبەشی دیاریدا کەلکیان لێ وەردەگرین:

مەستوورە رانیەیی ـ رەحیم بەهرامی ـ عومەر سەلامی م ـ ع ـ مەحموود جیهانی ـ ک ئیبراهیمی ـ سەیدنجمەدین عەبدوڵلاپوور ـ م ـ شیوەن عوسمان کاژەیی ـ فایق یۆسفی سامال غەمبار ـ سەلاح سەید محەممەدی ـ کەریم کەریمی حوسێن ئەمین ـ موحسین مەسعوودی ـ پەرویز ـ م ـ جەعفەر جاویدفەر ـ سەعد ئەمیری، حوسێن عەبباسی رەحیم باپیرپوور ـ ج ـ ق ـ مالە ـ حیسام فاتمی ـ محەممەد دلێر ـ سەلام سوارە ـ سەلاح شێربەگی ـ سەلاحەدین سەید حەبیب ـ محەممەد ئەمین لەشکری ـ حاسڵ قادری ـ ئەمیر محەممەدی ـ سمایل قالۆپی رەحمان حاجی ـ کەمال یۆسفی عوسمان خزرپەنا ـ حوسێن چووکەلێ ـ ئەحمەز هرایی سەلیم حوسێن ئاسی ـ حوسێن شێخ ئاغایی ـ ئەحمەد بەحری محەممەد بایەزیدی ـ عەلی زالە ـ سەعید محەممەدزادە، سەید واحید شوکری ـ تاراو ،باقی سەفاری ـ مەعرووف فتووحی ـ هوشیار بێورەیی مستەفا مامەند چۆمانی قادر قادری اقدم ـ محەممەد ئەمین مودەرریس ـ سەید ئیسماعیل سەید شوکری محەممەد ئەمین سەید عەبدوڵلاهی محەممەد رەسووڵ بولەندگرامی ـ ش ـ ع ـ خەمبار سولەیمان مەجیدی ـ خدر مەحموود روستەم ـ سەید لەتیف قادر زادە ـ رەسوول محەممەدی ـ هیوا ـ ئازاد، مەلاقادر ـ سەعید بێبەش عوسمان کەس نەزانی ـ عوسمان ئیسماعیل پوور ـ ئەبووبەکر رەشیدی ـ سولەیمان بێبەش زورار پەیغامی ـ زورار مەنگوری لالە ئەحمەدی ـ م ـ اوستا زاهید قەڵاتیانی ـ حەسەن پەرێشان ـ ئیبراهیم رەحیمی

" شەفیع جەهانگیری "

نامەودیاری ئەم ئازیزانەشمان بەدەست گەیشتووە سپاسیان دەکەین.

سەلاح عەرەبی، ئەرسەلان مامڕەسوو، غەفوور ئەحمەدی ئەبووبەکر رەحمانپوور ئیبراهیم ـ ق، عەلی سولەیمان ـ زادە، ناسرناسری، سەنگان مستەفا رەحیمی، محەممەد کەریمزادە، عەبدولقادر بەرزەنجی، شەهلا حەسەن نژاد، بەختیار میعماری، سەعید شەرافەتی، سولەیمان عەبدی محەممەد سوباتی، ئەنوەر راوەندی، ئیبراهیم رەبانی محەممەد تەنهایی، سولەیمان زەینەدینی، رەسولی مەجالی عومەر ئەحمەدزادە، عەبدولعەز ـ یززەمبیلی، سیروان ـ الف محەممەد ئەحەدی، م ـ ئوستا، محەممەد میوانەای، عومەر زیرەک، خالید حوسێن پوور فەیزوڵلە سەجادی، عوسمان مستەفا پوور، مستەفا شاریکەندی کەریمدافعی، محەممەدزا هیر علیپوور، حامید نیعمەتی، سەلام کەریمی، فەرهاد جەهان میهەن قادر ئارمەند، فەرهاد شەریف ـ نژاد، جەلیل پوورشاد، جەعفەر رەحمانی، عەبدوڵلە ئەحمەدبریوی، رەسوول رەشەـ حمەدی، سەیدرەسوول گوڵدەستی جەعفەر جاویدفەر، ئازاد مەلا قادر، کاوە خالید، محەممەد رەسوول برووشان، حاجی رئووف سەلیمی، محەممەد مەولانی، مرادرەسوول ئەحمەدی، عەبدوڵلا عەلیپوور، ج، ئاشتی، زەزا رەحمەتی، سەیدعەبدوڵلا سەمەدی جەبار مەحموودگلاری محەممەدئەمین شامحەممەدی ئەحمەدشەریف پەنا، هیوا، محەممەدئەمین مەولانی، ئەنوەرساوجبلاغی، سولەیمان پوورمحەممەد، حوسێن شێخەزادە مستەفا ئیسماعیل پور، رەحیم بەرقی جانی، سەباح رەسووڵ جبراییل، مەسعوود ئیسماعیل سەدەفی، ک ـ د ـ ئازاد،

بەر لەوە باسی ژن بەژنە درێژە پێ بدەین پێویستە چەند وردە باسێک روون بکەینەوە .

ژیانی کوردەواری بە درێژایی مێژوو لەسەر کشت و کاڵ و ئاژەڵداری دابین کراوە ئێستاش لە سەردەمی ئێمەدا کە سنعەت و بازرگانی وکارمە-ندی لە شارەکاندا پەرەی گرتووە ، کاری کشت و کاڵ و

نێوان ناخۆشی یان بووە و زۆر جار دیتراوە کوشت وکوشتارێکی سامناکیان لێک کردووە و چەندین کەسی بێ تاوان بوونە دەستەچیلەی ئەم ئاورە .

هەڵبەت ئەم شەڕ و نێوان ناخۆشی یانە چەند هۆی هەیە کە دەکرێ لە نێو ئەواندا ئیشارە بەم چەند خاڵەی خوارەوە بکەین .

هەڵدایسێ و زۆرکەس دەکوژرێن

- بۆ ژیانی عەشیرەتی گەورەترین شت مەڕە . بۆ باشتر بەخێوکردن وپەروەردەکردنی مەڕوپاتاڵ پێویستی بەتفاق و لەوەڕگە وگەوەڕی زەنوێر و بژوێن هەیە . کوێستان وهەوارە مەڕیش وەک ڕێ وبان لەنێوان چەند هۆزو عەشیرەدا بەش کراوە . هەر عەشیرەیەک زۆر-

ژن بە ژن

کەریم
قەییوومی

# ۲ ...ژن بە ژنە؟

ئاژەڵداری لە گوندەکاندا هەر درێژەی هەیە و زوربەی خەڵک لەم رێگەوە بەڕێ دەچن .

**١- ژیانی کۆچەری :**

هەموو دەزانین کە ژیانی کورد لە رابردوودا خێڵەکی بووە و کوردستان لە چەند هۆز و ئێل و عەشیرە پێک، هاتووە کەهەر یەکە بۆ خۆی هێندێک تایبەتی سەربەخۆی بووە . لە لایەکی دیکەشەوە ئەم عەشیرەتانە لەگەڵ یەکدی

- ژیانی مەڕداری پێویستی بەگەرمێن و کوێستان هەیە و رێگەی هەوارێش لەبەر دەستی عەشیرەتێک یا چەند عەشیرە دایە . جا ئەو مەڕدارەی پێیدا تێدەپەڕێ دەبێ باجێکی بدا بەم عەشیرەتە کە رێگاکەی بەدەستەوەیە . جالەسەر ئەوە کە رێگەی هات وچۆی دەبەستوێ یا خۆ عەشیرەتەکە دەیەوێ ئەم رێگایە لەبەردەستی خۆیدا بێ، شەڕ و هەڵلا،

تری جێ ورێ بەدەستەوە بێ بەدەستەلاّتترە . زۆرجار لەسەر ئەوە کە مەڕی ئێلێک پەڕیوەتە بژوێن وبێرروپاوان و **گەوەڕی** تایبەتی ئێلێکی دیکە ، بۆتە هۆی شەڕوهەڵلایە-کی زۆر .

**کچ لێک هەڵگرتن :**

ئەو مەبەستەش لە ژیانی عەشیرەتیدا زۆر گرینگە .کوڕی عەشیرەتێک کچ لە عەشیرەتێکی دیکەهەڵدەگرێ ودەبێتە مایەی

شەڕو نێوان ناخۆشی .چون ژن ومنداڵی عەشیرەت ، ناموسی هەموو عەشیرەکەیەوبەدرێژایی مێژوو زۆرترین وسامناکترین شەڕ و کوشت و کوشتار هەر لەسەر مەسەلەی ناوبراو ساز بووە .

بەڵام بۆ کچ هەڵدەگیرێ . ئەوەش بابەتێکە کە دەبێ بە وردی قسەی لەسەر بکرێ .

رەنگ بێ بەرواڵەتپێوەندی بەباسەکەوە نەبێ بەڵام بە بڕوای من نەتەنیا زیادی نیە بەڵکوو هۆیەکی بنەڕەتی ژن بەژنەشە .

لە ژیانی عەشیرەتیدا کچ خواستن بەر لە هەموو شت بەستە بە نەزەری سەرۆک عەشیرەتە . یانی خوازبێنی لە سەرۆک عەشیرە دەکرێ و رەزاو ناڕەزایی سەرۆک عەشیرە دەبێتە هۆی سەرگرتن و سەر نەگرتنی زەماوەند .

دوای ئەوە کە سەرۆک عەشیرە رازی بوو ( کە رازی بوونی ئەویش چەند شەرتی دیکەی هەیە ) ئەمجار دەبێ باوکی کچەش داوای خۆی بکا ، ئینجا کچ مارە بکرێ .

دوای ئەوە کە کیژ مارە کرا دەبێ بە بۆنەی ئەم پێوەندە شیرینەوە **دیاری یەک** بۆ سەرۆک عەشیرەت بنێرن لە بەران و نێری یەوە بگرە هەتا کەڵەشێر وقەندو ....

دوای ئەوە کە دیاری ئەرباب گەیی ، نۆرە دەگا بە **چەکە خالانە** خاڵی کیژ بۆئەوە کە رەزابێ دەبێ لەم سێ شتە یەکیانی بۆ بچێ ئەسپ،تفەنگ دەمانچە .

دوای ئەوە وەختی گوازتنە۔وە نۆرەی **پشتەدەری** یا **پشت دەرکانە** . یانی یەکێک لە پشت دەرکەی ئەم دیوە کە بووکی تێدایە رادەوەستێ و

نایەڵێ بووک بەرن ، هەتا پشتەدەری وەرنەگرێ .

هێندێک کەندوکۆسپی ورد و درشتی دیکە ...

پاش ئەم کورتە باسەواباشە بێینەوە سەرئەسڵی باسەکە و ژن بەژنە لەژیانی خێڵەکیدا باس بکەین . ژن بەژنە لەئێل و عەشیرەتدا دوو هۆی هەیە یەکیان ئەوەیە کە وەختێک کچی عەشیرەتێک دەچێتە نێو عەشیرەتەکەی دیکە دەبێتە هۆی خزمایەتی و پێوەندی نزیک لە نێوان هەر دوو عەشیرەتدا کە تا رادەیەکی زۆر دەبێتە بەرهەڵستی شەڕ و کێشە .

هۆیەکی دیکەشی ئەوەیە کە هەردووعەشیرەت دەتوانن لە، گەوەڕوهەواری یەکدی کەلک وەرگرن ولە هەموان گرینگتر بنە پشتیوان و پاڵپشتی یەکدی لە بەرامبەر هێرش و پەلاماری عەشیرەتەکانیدیکەدا چون یەکێک لەتایبەتی‌یەکانی ژیانی عەشیرەتی ئەوەیە کە هەمیشە ئێلی بە دەستەڵات ، پاوان خوازی کردووەوعەشیوت و هۆزی بچووک و کەم دەسەلاتی لەژێر چۆک ناوە و مافی ژیانی پێ شێل کردووە

لە لایەکی دیکەشەو بوونی کچ بارمتەیە کە لە لای هەر دوو عەشیرەت یانی ئەگەر جارێک نێوانیان تێک بچێ و

ئاگری شەڕ وکێشە هەڵایسێ.ئەم مەبەستە تا رادەیەکی زۆر لە تینی ئەم ئاگرە کەمدەکاتەوە بە تایبەتی ئەگەر هەر دوو منداڵیان لێک بێ .

لەم باسە ئەو ئاکامە وەردەگرین کەچۆن کورد لە ژیانی خێڵاتی خۆیدا هەمیشە لەمەترسی هێرش بردنەسەر و تاڵان وبڕۆدا بووە لەوە دەگەڕێ تا بتوانێ **دەستە کۆمەگ** بۆخۆی زیاد بکا ، بۆ ئەوە بشێ بژی و مەترسی نەمان و فەوتانی نەمێنێ .جا چ لەوە باشتر کە هەم کچ بدا و هەم کچ بستێنێ و هەمیش پشتیوانێک بۆخۆی پەیدا بکا . جائیدی ئەم پێوەندە بە گیانی دوو ئینسان کایە دەکا وچارەنووسی دووئینسان

بەشێکی دیکەی کورد لەدێ و دێهاتی کوردستان بنەگر بوون و هەر پاشماوەی ژیانی خێڵەکی یە کە گۆڕاوە و بەم شێوەخۆی نواندووە .کەوابوو ئەم خووخدە تا رادەیەکی زۆر هەر ماوە .

ئەوانە کەژیانی وەرزێری ـ یان هەیە ، رەنگ بێ لەنێو ئەوانیشدا مەڕدار ببێ بەڵام بەگشتی ژیانی وەرزێری بە مانای گشتی مەبەستی باسی ئێستەمانە

ژیانی وەرزێر بەستە بە زەوی یە و زەوی پێویستی بە

ئەندامانی خاوخێزان ئەرکێکی گرینگیان هەیە . یانی منداڵ هەر کە پێی لە سێ ساڵی نا **دەینێرێتە بەرقازان** .دوایە **دەچێتە بەر گوێرەگەل** و پاش ئەوە هەڵیدا یا **دەچێتە بەر وڵاغان** یا **شان بەشانی باوک کار دەکا** . دوایەش دەستەیەکی زۆر کەم وەبەر خوێندن دەندرێن و ئەوی دیکە شوێنی باب رەچاو دەکەن .

وەکی لە پێشوودا باس کرا مەبەست لە خزمەتی زەوی **بژار** و **دەسگەنە** وئەمجۆرە شتانەیە ئەگەر بنەماڵەیەگی جووتێر دەستەکۆمەکی نەبێ ناچارە کرێکار بگرێ جا ئەم چەشنە کارانەش لە دێهات بە کیژ دەکەن. کاتێک وەرزێرێک کیژەکەی بە شوو دەدا لایەکی

دەخاتە مەترسی یەوە. بۆهیچ لا گرینگ نیە. کە دەڵێم چارەنووس مەبەستم ئەوەیە کە زۆرجار کیژێکی کەم تەمەن لە سەرۆک عەشیرەتێکی گەڕاوە مارە دەکرێ یا بە پێچەوانە

**٢ـ ژیانی بنەگر :**

خزمەت هەیە. هەتا پەلە زەوی یەک پێدەگا دەبێ بە چەشنی جۆراوجۆر پێی رابگەن و خزمەتی بکەن. بەتایبەتی نۆک و چەوەندەر و چەڵتووک و بێستان و توتن و...

لەژیانی وەرزێڕدا هەموو

لێ دەبێتەوە چون یەکێک لە ئەندامانی بەکاری خێزان لە ماڵ وەدەردەکەوێ .

دەبێ پوول وپارەیەک بدا بە جیاز جا هەر کەسەلە**قەدەر** خۆی .

دەبێ یەکی دیکە بێنێتە

جێگای ئەو کە هەم پوولێکی دەچێ وهەمیش وەک ئەوی خۆی نایەتەوە (رەنگ بێ دوایی ماڵێ خۆی بکا)

وەکی دەستەڵاتی بەسەرکچدا هەیە، بەسەر کوڕدا نیەتی.. چون کچ لە کوڕ داماوتر و بێ دەستەڵاترە. دەبێ ژن بۆ کوڕی بێنێ. ئەویش چەند خەرجی زیادی دیکەی هەیە.

وەرزێڕ دێنێ لەبەرەخۆیەوە حیساب دەکا وا بە سەرفەیە بنەماڵەیەک پەیدا بکاو ژن بەژنەی لەگەڵ بکا.

دیسان ناچارین لە باسەکە دوور بکەوینەوە و ئەم، مەبەستە شێ بکەینەوە کە لە دێهاتی کوردستان وەرزێڕ پێویستی بە پشتیوان وپاڵپشت هەیە بۆ ئەوە لەسەر زەوی و زار زوڵمی لێ نەکرێ وبنەماڵەی بەدەستەڵاتتنی رۆنەیەن.

جا کەوابوو دەگەڕێ تا بنەماڵەیەکی باش دەبینێتەوە لەو چوار دڵە کەلەمەسەلەدا دەوریان هەیە جاری وایە دوو رازین وئەویدی نارەزا. جا یا لەبەر خاتری قسەی دایک وباب متەقیان لەبەر نایە و یا بە زەبر و زەنگ و **زەبری هەڕەشە وگورەشە** و لێدان وکوتان مەسڵەت سەر دەگرێ.

بەگشتی هۆی هەرە گرینگی ئەوە کە پیاوی کورد دوو ژن و سێ ژن دێنێ ئەوەیە کە خێزانێکی زۆری ببێ بۆ ئەوە کە هەم کاری خۆی بۆ خۆی جێ بەجێ بکا، هەم خۆی لە تێ رۆهاتنی بنەماڵەی دیکە بپارێزێ.

ئەمجار ژن لە کۆمەڵی کوردەواریدا پێویستی بە باسێکی دوور و درێژ هەیە کە خوا یار بێ وەختی خۆی لێی دەدوێین. بەڵام لێرە بەکورتی ئاشیرە بەوە دەکەین کە ژن چارەنووسێکی نادیاری هەیە. باب بۆ ئەوە چارەنووسی کیژەکەی تاڵ نەبێ ناچارە داوای مارەیی زۆر بکا کە لە لایەک پشتیوانی چارەنووسی کچەکە بێ وئەگەر سۆزی تەڵاق درا بتوانێ بەم مارەییە بێ منەت بژی و لە لایەکی دیکەشەوە پێی وایە مارەیی زۆر بەرگری لە تەڵاق دان و ژن بەسەرهێنان دەکا.

جا وەرزێڕ یا کیژەکەی ئاوا بەمێرد دەدا یا ژن بە ژنەی پێدەکا. ئەگەر ژن بە ژنەی پێ بکا بارمتەیەکی لە لایە یانی باربەهای کچەکەی لە لای خۆی راگرتووە. لێرەدا بێ ئەوە کیژ هیچ دەورێکی لە ژیانی خۆیدا ببێ چاوەڕوانی بڕیاری دایک و بابە. ئەگەر کیژێک دانەنیشت کیژەکەی دیکەش باوەخوێن دەکرێتەوە و بەمجۆرە پاش حەول وتەقەلایەکی زۆر کارەکە هەڵدەوەشێتەوە و معامەلە! پووچەڵ دەبێ!

جا لەم نێوەدا چەند کۆرپەی ساوا دەبێتەقوربانی هەموو بەچاو دیتوومانە!؟

**دریژەی هەیە**

وتووێژێك دەگەڵ: ع خزری

پرسیاری ١٣- فۆلکلۆری
کوردی وبەتایبەتی بەیت و
باوچ شوێنێکەلەسەردەولەمەند
بوونی زمان دادەنێن ؟

وەلام :راستی ئەوەیەژیانی
ماشێنی وچوونەسەری پلەی
زانست وئاگاداری وتەنەوەی
باری ئەدەبی لەلایەک وبە
خزمەتگرتنی هونەر لەزەمان
وکاتێکداکەهونەرکەرەسەیەکی
زۆر گرینگە لەرێبازی بردنە
سەری فەرهەنگی خەلکەلایەکی
دیکەوە ئەو پێداویستییە
دێنێتەپێش کە زمان رۆژلەگەل
رۆژ بەربلاوتربێ وشاعیر و
نووسەرو رەخنەگر وشەومانای
زۆرتریان لەبەردەست بێ کە
بتوانن ئەوەی لەدلیان دایەو
لەمێشکیاندا دەگوورێ بێننە
سەرکاغەز.

ئەوپێداویستییە لەهەر
ولات ولەنێوهەر گەل ونەتەوە-
یەکدا بەجۆرێک خۆدەنوێنێ و
هەرکەسە رێگایەک بۆ
چارەسەری ئەمدەردەدەبینێتە
-وە. بەلام ئەوەی لەنێو
ئێمەدا زۆر بەداخەوەبۆتەباو
تائێستاش زۆر زەبری لەزمانی
نەتەوەکەمان داوەوەشەداتا-
شین وکەلک وەرگرتن لەوشەی
نامووبێگانەیە. یەکێک لە
نووسەرەکانی خۆمالی دەوشە
داتاشیندا وەستایەدووووشەی
چوار کەرتکردبوو لەدوویان
وشەیەکی سازکردبوو خۆشی
هەلدەمساند وبێتەعاروف
دەیگوت :ئەوە ئەزم وادەکەم
ئاخر بیستبووی لەتەبیعەتدا
"شترمرغ" هەیە!! سەیر
ئەوەیە زۆربەی ئەوکەسانە
دلسۆزی بۆپاراو بوون وپوخت
کردنی زمانی یەکگرتوودەکەن
جا لەوەلامی پرسیارەکەتدا
دەبێ بلێم زمانی بەیتەکان
زۆر رەسەن وپوخت ورەوانە
ئەگەر بێتوو رۆژێک بەیت و
باوی کوردی تەواوی ناوچەکان
کۆبکرێتەوە وئەوکارەی لە،
باری زمانناسییەوەپێویستە
لەسەریان بکرێ بۆهیچ
وشەیەک دانامێنین .

شوێنی بەیتەکانی کوردی
وهەموو بابەتی فۆلکلۆری بە
جوانی لەشیعرەکانی خوالێخۆ
شبوو مامۆستا هێمندا
دەبیندرێ.بەیت وباو شوێنی
لەسەر ئەوشیعرانە داناوەو
رەنگە یەکێک لەهۆیەکانی
سەرکەوتنی شیعری هەر ئەو
وشە رەسەن و جوانانەی
بەیتەکان بن . نەک هەر
زمانی بەیتەکان بەلکوو لە
زۆر جێ تەرکیبی بەیتی
شیعرەکانیش لەوشیعرانەدایە
یەک دووکەسی دیکەش
دەستیان بەم کارە کردووە و
زۆر جوان دیارە لەلایەن
خەلکەوە پێشوازی ئەو کارە
کراوە وئەو شیعرانە لەنێو
خەلکدا جێی خۆیان کردووتەوە
لەلایەکی دیکەشەوەهەروەک
گوتم ئەگەر تەواوی بەیت وباو
وشوێنەواری کولتووری
نەتەوایەتی وفۆلکلۆری کوردی

تەواوی زاراوەکانی کوردی
کۆبکرێتەوە، شۆڕشێکی بێ
وێنەی ئەدەبی رووددا،
ومەبەستی زمانی یەک گرتوو
بەدی دێ وئەوەی وشەی نالە
- باروەق وزەق وداتاشراوە
لەزمان وەدەردەکەوێ بۆوێنە
لەمەهاباد وەدەروروبەر بە
سیب زمینی فارسی دەڵێن
یەرەڵماسی کەتورکی یە - لە
خوارووی کوردستان دەڵێن
سێف زەمینی کەدیسان نیوەی
فارسی یە. لەعێراق دەڵێن
پەتاتە کە ئینگلیزی یە بەڵام
لەزاراوەی کرمانجی سەروودا
دەڵێن سێوک یا سێڤک کە بە
بڕوای من لەوبارەوە کەلانی
کەم وشەیەکی تەواو کوردی
ورەسەنە سێوک یا سێڤک
جوانترین جێگری سیب زەمینی
وپەتاتە ویەرەڵماسی یە و
لەوانەیە ئەگەر بەنێو.

زاراوەکانی دیکەی کوردیشدا
بگەڕێن لەسێوک جوانتریشمان
هەبێ.

ئەمن ناتوانم لەوت و،
وێژێکی ئاوادا لەوشەی بێگانە
یاداتاشراوی لەمێژداسەپاو
خۆ بپارێزم چونکە یا تەواوی
ئەو خەزێنەبایی دارەم نیە
یاناچارم بەزمانێک کەئەورۆ
هەمووکەس دەبێ لێی حالی بن
بدوێم. ئەویش نەک هەمووکەس
بەڵکوو زمانێک کەبەناتەواوی
باوە - چونکوو ئەم کارەی،
کەگوتم لەوت ووێژێکدا
ناگونجێ ودەبێ زۆر بەوردی
وبەحەوسەلە کاری لەسەربکرێ
کەوردەوردە جێی خۆی بکاتەوە
زمانێک کە بەڕاستی نە زمان
وزاراوەی ناوچەیەکی تایبەتی
بێ وئی هەموو ناوچەکانیش
بێ.

یای ئێرانی کەلباسی
کتێبێکی زۆر لەبارو بەنرخی
بڵاوکردوتەوە بەناوی "گویش
کردی مهاباد." کەلەودا بە

شێوەیەکی زۆر عیلمی ولەبار
وجوان کەوتۆتەشێ کردنەوەی
تەواوی بارەکانی ئەوزاراوەیە.
کارێکی یەکجار پڕ زەحمەت و
گران وبێ وێنەیە بەڵام
ئیرادی ئەوەیەکە ئەوانەی
ئەم بەڕێزەیان یارمەتی داوە
دەتوانم بڵێم لەمانای
زاراوەش بەجوانی نەگەیشتوو
- ن. کەسێکی کار لەسەر
زاراوەیەکی زمان دەکالانی
کەم دەبێ ئەوەندەی لەبەرچاو
بێ لەشارێکی وەک مەهاباد
چەند زاراوەی جۆربەجۆر
هەیە شێوەدوان وزاراوەی
بنەماڵەیەکی تێروتەسەل
پڕخوێندەواری لەشاران
خوێندوو لەگەڵ شێوەدوانی
بنەماڵەیەکی کاسبکاری
شارەیی وبنەماڵەیەکی تازە
ماڵی هاتۆتە شارجیاوازی
زۆرە.

دەرد ئەوەیە کە ئێمە
تەنانەت زاراوەی شارێکی
بچووکمان جارێ بۆساخ
نەبۆتەوە. مەبەستم ئەوەیە
کاتێک بەیت وباو وبابەتی
فۆلکلۆری تەواوی ناوچەکان
کۆکرانەوەوشان بەشانی
بارەکانی دیکە کەباسمان
کرد کاری زمانناسی لە
سەرکرا وئەوەی هەمانەلەبەر
دەست بوو،... یای کەلباسی
دەتوانێ بەشێنەیی ودڵنیایی
کاری لەسەر بکا وئەوەی
دەیخولقێنێ دەبێتەگەنجێکی
بێ وێنەو جێگەی شانازی لە
کتێبخانەی کوردیدا،
دۆزینەوەی ئەو وشانە "تلپات"
" نەبەدی" لەدوو بابەتی
فۆلکلۆری:
"تلپاتی تەریش شک نابا"
" تیری نەبەدیت وێ کەوێ"
رەنگ بێ نیا زمان بکا لە
دوو وشەی نامویا داتاشراو،
ودزێو ووشک وەرەق.

زمان کەس دایینەناوە
وکەسیش داینانی بەیت وباو
وبابەتی فۆلکلۆری کوردی.
نوێنەری هەموو بارێکی روحی
و ئەخلاقی وفەرهەنگی وزمان
ومێژووی گەلە کەوابێ
باشترین کانگابۆ دەولەمەند.
کردنی زمان وسەربەخۆیی
ئەو هەر ئەو بابەتانەن
کەباسم کرد.

# ف : وەفایی

بەبڕوای زۆربەی زانای ڕەفتارناس وشەی "ئافەرین"لە بارهێنانی منداڵدا زۆرگرینگە.

منداڵ هەر کارێک دەکا مەبەستی ڕەزامەندی دایک و باب ودڵخۆشی ئەوانە . بۆیە دەبینین دەست بۆ هەرکارێک دەبا خێرا چاو لە نێوچاوانی دایک وباب دەکا و پاشماوە و ئاکامی کارەکە لەچاولێکردن و ڕوانینی ئەواندا دەبینێ ئەگەر دایک وباب نێوچاوانی گرژ و تاڵ بووکارەکەدووپاتە ناکاتەوە.بەڵام ئەگەر تووڕە نەبوون وزەردەیەکی بەسەر لێویانەوە دیت درێژە بەم کارە دەدا. جا ئەگەر ئەم زەردەیە،ئافەرینێکی لەگەڵ، بێ کارەکە چەندجار دووپاتە دەکاتەوە. یانی باوەڕ و مەتمانەی بەخۆ دەبێ و هەست بەخۆشەویستی دایک وباب دەکا.

بەڕاستی منداڵ هەمیشە بە دوو ئەوەدا دەگەڕێ کە دایک وباب ودەوروبەری خۆشیان بوێ

یا وەختێک منداڵ لەفێرگە دەگەڕێتەوە و خۆلە باوەشی دایک وباب داوێ ودەڵێ" دایە بیستم وەرگرتووە" دەبێ چ جوابێکی بدرێتەوە؟ دەڵێن "باشە بڕۆئەولای ......جارێ کارم هەیە!" یا " جارێ ڕۆژنامەم بەدەستەوە" "چای تێدەکەم" و.... یا باوەشی بۆ دەکەنەوە ئەم لاو ئەولای ماچ دەکەن ودەڵێن "ئافەرین ڕۆڵە! بەخێر بێیەوە. وەرە دانیشە بادەفتەرەکەت ببینم! دادەی پێشانم دە بزانم بیستەکەت جوانە!"

بەداخەوە لەفێرگە زوربەی ماموستاکان تەنیا هەڵەی منداڵ دەبینن وکاریان بە پێشکەوتی ئەوەوە نیە. تەنیا ئەگەر هەڵەی کرد توانج و تەشەرێکی گرچووسری پێدا دەدەن یا بە قەڵەمێکی سوور خەتێک بەژێر هەڵەکەدا دێنن بێ ئەوە کە ڕاستەکەی لەپەنا بنووسن ورێنوینی بکەن.

زۆرجاریش لەبەرچاوی هاوکلاسەکانی وەدەری دەنێن و دوو سێ جاریشی " تەمبەڵ " و "تەوەزەل" پێدەڵێن.بەداخەوە هێندێک لەخۆ ناپرسن کە چمان فێرکردووە چەند جارمان دەستی خۆشەویستی بەسەری منداڵ دا هێناوە؟ چەند جار قسەمان لەگەڵ کردووەوچەندمان حەول داوە بۆئەوە کە منداڵ لەخۆمان نزیک بکەینەوە یا چەندجار بە بیستنی وەڵامی ڕاستی پرسیارێک ئافەرین مان پێگوتووە .

ڕەنگە زۆرکەس پێیان وابێ وشەی ئافەرین بەتەنێ هیچ دەردێک دەرمان ناکا و هیچ کەلکی لێ وەرناگیرێ. بەڵام واش نیە .چون زانای ڕەفتار ناس زۆریان ئەم مەسەلە تاقی کردوتەوە وبە زۆر باراندا لێی ورد بووەوە و ئەم ڕاستی یەیان سەلماندووە کە

دنەدان وهاندانی منداڵ
یەکجار گرینگە ودەوریکی
بەرچاوی لەبارهێنانی منداڵدا
هەیە .

نابێ ئەوەشمان لەبیربچێ
کە وشەی ئافەرین وەختێک
بایەخی هەیە کە بۆهەموو شت
دەکار نەکرێ.زەردەخەنەیە کی
تەنێ لەگەڵ پێکەنین وئافەرین
جیاوازی زۆرە بۆیە دەبێ
ئاگاداربین کەنگی ولە کوێ
کەلک لە ئافەرین وەربگرین و
بۆ چ کارێک بلێین ئافەرین.!

ئەگەر منداڵ لە روو ی
نەزانی کارێکی هەڵە وچەوت
بکا ودایک وباب بەزەردەخەنە
وەڵامی بداتەوە وادەزانێ هەر
جارێکەوتازە دووپات نابێتەوە
بەڵام دەبینین کارێکی یەکجار
هەڵەی کردووە وسڕینەوەی ئەم
خاڵەڕەشە لە مێشکی منداڵ زۆر
ئەستەمە .

بەداخەوە زۆرجار دەبینین
کە دایک وباوکەکان بەگاڵتە
شەڕەجنێو لەگەڵ منداڵەکەیان
دەکەن وبەڕاستی منداڵ لەو
ساتەوە فێری جنێودان وقسەی
ناشیرین و دزێو دەبێ. چون
هەرکە یەکەمجار قسەیەکی
سووکی لەزار هاتەدەر قاقا
پێی پێدەکەنن . بەڵام ئەگەر
ئەو جنێوە لەنێو خەڵکدا
دووپات بکاتەوە مەپرسە ڕەنگ
بێ هەرلەوێ دارکاری یەک
نۆشی گیان بکا . یا لەنێو
خەڵک دایک وباوک دەنگ نەکەن
و لەماڵ تۆڵەی حەوت تۆڵەی
لێ بستێننەوە .

دایک وباب ئیدی ئەوەی
لەبیر چۆتەوە کەبۆخۆی فێری
شەڕە جنێوی کردووە. منداڵ
لەم نێوەدا سەری لێدەشێوێ .
نازانێ چ بکا؟ نازانێ بەکام
هەوا هەڵپەڕێ . جارێک بۆ
کارێک هەزار ئافەرین وبارە-
قەڵای وەرگرتووە وجارێکی دیکە
هەر بۆئەو کارە هەزار جنێوو
هەڕەشە . منداڵ لەم تەمەنەدا

درۆو دەلەسە فێر نەبووە کە
وەک ڕێوی فێل بکا وبە هەموو
بایەک شەن بکا .

جاری واشە دایک بۆکارێک
کە منداڵەکەی دەیکا ئافەرینی
پێدەڵێ بەڵام باوک لێی تووڕە
دەبێ .دایک خۆشی لەم ئاکارە
دێ بەڵام باوک پێی تووڕەدەبێ
دیسان منداڵ سەری لێ
شێوێ ونازانێ بە قسەی
کامیان بکا ، چونکە دەترسێ
دڵی یەکێک لەوانی لێ ببێ .
بۆیە دەبێ دایک وباب بۆ بار
هاتنی باش وبەجێی منداڵ هەر
دووک شێوەیەک ڕەچاو بکەن
چونکە منداڵ حەز بەوجیاواز-
ی یە ناکا . هەردوولای خۆش
دەوێ وپێی خۆشە هەردوو لاش ،
ئەویان خۆش بوێ .

هەموو دیتومانە جاری وایە
منداڵ کارێک دەکا زۆر پڕ
مەترسی یە یاکاری گەورانە و
جێی سەرسوڕمانە .تەنیاوتەنێ
هەر بۆ ئەوەیە کەئافەرینێک
وەربگرێ .

واش هەیە منداڵ دەیەوێ لە
جێگەیەکی زۆر بەرز باز بدا
یا شتێکی قورس هەڵ بگرێ کە
بەڕاستی لە ورەی ئەودا نیە
بەڵام دەیەوێ ئافەرینێکی پێ
بکا .

لێرەدا ئەرکی دایک وباب
ئەوەیە کە بەرلەوە ڕووداوێکی
دڵتەزێن ڕووبدا ئەم
ئافەرینەی بۆ کارێکی سانایی
و بێ خەتەر پێ بڵێن .

بەکورتی وەختێک منداڵ لە
دایک دەبێ هیچ خووورەوشتێکی
تایبەتی پێ نیە . هەر کە لە
دایک دەبێ چاکەوخراپە نازانێ
منداڵ تەنێ بەم مەرجە مێشکی
ساغ بێ،پسپۆر وزانا یاگێل و
گێژ نیە . بەڵکوو ئەوە کۆمەڵ
وشێوەی بارهێنانی کۆمەڵە کە
ئەو منداڵە زانا یا حۆل
باردێنێ .

ڕۆژێک بوو ، ڕۆژێک نەبوو . قەدیم حاکمێک بوو پێی خۆش بتوانێ لە سەرەخۆ وبە سەبر ودڵسۆز بێ بەڵام نەیدەتوانی ئەگەر کارێک بە پێچەوانەی مەیلی ئەوکرابا تووڕە دەبوو ، فەرمانی توندوتیژی دەدا . دوایەش پەشیمان دەبۆوە . ئەگەر نەشی توانیبا تووڕەیی خۆی بە کەسێک بڕێژێ ، دڵی دەگیرا وخەم‌دەرد دەورەی دەدا ولەوانە بوو دیق. هەڵێنێ .

هەروەختێک بەشتێک خۆشحاڵ دەبوو خۆی لێدەگۆڕا و غلوور دەبوو فەرمانی سەیرسەیری دەدا ، زوڵمی دەکرد ، خەڵکی ئازاردەدا بەڵام دوایە خاودەبۆوە ولەکاری خۆی پەشیمان دەبۆوە ودەیگوت :

ــ ئاوا هەموان لە خۆ دەتۆرێنم ڕۆژێک دانیشت . کڵاوی خۆی کردە قازی وبە خۆی گوت :

ــ ئەوەکارێکی خراپە . ئەمن زوو هەڵدەچم وناتوانم هێدی وهێمن بم ڕەنگ بێ نەخۆش بم . واباشە حەکیمان بانگ بکەم بەڵکوو ئەوان چارەم ، بکەن . حەکیمی گەورەی شاری بانگ کرد وپێی گوت :

ــ حاڵ ومەسەلەی من ئەوەیە چ دەرمانێک بخۆم . حەکیم گوتی :

ــ قوربان ئەتۆ هیچ عەیب و نەخۆشی یەکی واتێدا نیە بەدەوا و دەرمان چاری بکرێ . نەخۆشی جەنا ــ بت بەدەرمان چاری نایە . ئەتۆ هەر لە منداڵی را واگەورە بووی وفرچکت ، بەتووڕە وتۆسنی گرتووە . ئەتۆ بۆ ئەوەی چاک بیەوە دەبێ کتێبان بخوێنی یەوە . لەگفتی گەورەپیاوان پەندوەربگری دەبێ بە خۆت بڵێی تازە تووڕەنابم یا ئەمن تووڕەنیم

ئەوەت هەمیشە لەبیربێ وقەت لە
بیری مەکە. عادەتی پێدەگری و
وەختی خۆشی وناخۆشی خۆت لێ ناگۆڕی
حاکم گوتی: راستە بۆخۆشم
ئەوەم دەزانی.

ئەوجار ناردی لەدوای مامۆستای
گەورەی ئەوزەمانی شار نەقڵی خۆی
بۆگێڕاوە. مامۆستا گوتی:

ـ واباشە جارجارەبچی بە
قەبرستان. بیری مەرگ بکەوە. ئەودەم
لەعاقیبەتی کارەکان خافڵ نابی و
بۆت مەعلووم دەبێ کە خۆشی وناخۆشی
دایمەنین. جا ئەوجار ئۆخژنت
دەکەوێتەدڵی. حاکم گوتی:

ـ بڕوابە، ئەمن کوا دەتوانم

هەتا کەیفم سازبوو یا تووڕەبووم
هەڵێم بۆ قەبرستان ولەوێ عیبرەت
وەربگرم. ئەمن دەستوورێکی هاسانتر
ـم دەوێ کە هەمیشەلەگەڵم بێ
مامۆستا گوتی: ئەگەر وایە چەند

کەسی زانا لەدەوری خۆت وەکۆ بکەو
لەهەموو کاراندا پرسیان پێ بکە
بێ پرسی وان فەرمان مەدە. ئەگەر
ناڕەحەت وتووڕە بووی، ئەوان

دڵخۆشیت دەدەنەوە. حاکم گوتی:

ـ بڕوابە. جا ئەگەر قەرا ربێ
ئەمن دەستوورم پێ بدەن ئەدی
حاکمەیتم دەکوێ دایە. ئەمن بۆخۆم
چاکەوخراپە دەناسم بەڵام وەختێک
تووڕەبووم یاکەیفم سازبوو
هەمووشتێکم لەبیر دەچێتەوە. ئەمن
لەقسەیەکی دەگەڕم لەسەر نەقیمی
ئەنگوستیلەکەمی بنووسم تا هەمیشە
چاوم لێی بێ. بارانم وێ کەوێ
تووڕەنەبم. ئەگەرشتێکم دی بەدڵم
نەبوو لەداخان هەڵنەچم. ئەگەر
رۆژێک تاریفیان کردم سەرە رۆنەبم
بەکورتی شتێکم دەوێ لە هەموو
حاڵێکدا ئەهوەنم بکاتەوە.

مامۆستا گوتی: باشەدیتنەوەی

قسەیەکی کورت کە بتوانێ هێندە
پڕبایەخ بێ زۆر سەختە. قسەی جوان و
بەنرخ زۆرن بەڵام هەریەکە بوشتێک
گوتراون. دیسانیش ئەگەر زۆربەپەلە-
ی دەبێ هەموو زانایان کۆبکەیەوە و
هەرکەس هەرچی دەیزانێ بیلێ. جا

هەرچی پەسندت کرد لە نەقیمەی
ئەنگوستیلەکەت بینووسە.

حاکم گوتی: زۆر جوانە. ئەو
کارەی دەکەم، دەستوری دا نامەیان
نووسین هەرچی قسەزان وعالم بوو
بانگ یشتنیان کردن کۆبوونەوەیەکی

گەورەپێک هات زانایان چەند رۆژان
هەر راوێژیان بوو وهەریەکەی لە
بارەی سەبر ولەسەر خۆیی شتێکیان
دەگێڕاوە. شیعریان دەخوێندەوە
وحەدیسیان دەگێڕاوە. بەڵام حاکم
هیچیانی پەسند نەدەکردو لە هەر

کامیان ئیرادێکی دەگرت. دیگوت:

ئەوە هەونیە وئەوەیان دوورو،
درێژە وئەویدی منداڵانەیە وهۆوە بە
دڵەوە نانووسێ و......

رۆژی ئاخری، پیرەپیاوێکی
گۆچان بەدەست کەلە ئاوایی
راهاتبوو، وە خەبەرێکی تازەی بۆ
حاکم هێنابوو، لەمەسەلەکە حاڵی بوو

مەجلیس ئیزن بدەن دەتوانی قسەکەت
بکەی. مەجلیس یەک دەنگ گوتیان
قوربان چۆن شتیوا دەبێ، ئێمە
شەورۆژ خەریکین. هەمووکتێبمان
سەرو بن کردووە هێشتا قسەیەکی
وامان نەدیتۆتەوە بەکاری جەنابت
بێ. چۆن پیرەپیاوێکی نەخوێندەوار-
دەتوانێ نوتقی بێ؟

گوتی: ئەگەر ئیزنم بدەن
ئەمن شتێکی دەڵێم کە لە وانە لە
هەمووان باشتربێ. گوێ بدەنێ

زەرەرێ ناکەن خۆ برالەئیز نم بدە ز ئەمنیش قسەی خۆم بکەم . خۆزەرەر وەکەس ناکەوێ . قسەکەم دەکەم ئەگەر پێتا ن باش بوو بەقسەم بکەن دەنا بەڕێی خۆمدا دەگەڕێمەوە .

حاکم گوتی :قەیدی ناکا لێی گەڕێن با قسەکەی بکا . زانایان ئیجازەیان دا کە پیرە پیاوی بێ سەواد قسەی خۆی بکا .

مامەپیرە بەخۆی وگۆچانیەوە . ئەوەچیە؟ مامەپیرە گوتی: بنووسە واش هەر نامێنێ !!

بەبیستنی ئەم قسەیە هەڵلاوبگر لە مەجلیس کەوت . یەک دەیگوت ئەوە بەکار نایە ،ئەویدی دەیگوت ئەوە کەللەی کۆنە . یەک لەوسەر هەڵیدەدایە و یەک لەو سەری. قەرە باڵغێک بوو مەپرسە .

حاکم گوتی : ئەمن بەش بەحاڵی خۆم زۆرم پێ جوانەلەهەموان ،

وەلای سەرووکەوت وبە دەنگێکی بەرز گوتی :

تائەو جێگایەی ئەمن خەبەرم هەبێ حاکم دەیەوێ قسەیەکی چووک و، پڕ مانالەسەر نەقیمی ئەنگووستیلەکەی بنووسێ .دەبێ ئینسان لە ناهومێد بوون وسەرەڕۆ بوون بگێڕێتەوە پێم وایە سێ کەلیمەی جوان هەیە ئەوە بابەتی نەقیمی ئەنگوستیلەی حاکمە . حاکم گوتی:

کورتتر وپڕماناترە ودڵی من بەوە نەبێ ئۆقرە ناگرێ، وەختێک ئەمن وەبیرم بێتەوە کە هیچ شتێک وەکوو خۆی نامێنێ وخۆش وناخۆش هەتا سەر نین وهەموویان هەر دەگوزەرێن دڵم ئارام دەبێتەوە و وەختی ئەوەم. دەبێ کە بیر بکەمەوە وزیاتر لە ئەندازە ناهومێد وسەرە ڕۆنەبم .

تکایە بەر لە هەموو شت خۆت بناسێنە .

من ڕەشیدی فەیزنژاد دانیشتووی سەقز ساڵی ١٣٣١ لە گوندی ئاڕەبۆغڵوو لەدەوروبەری سەقز ، لە بنەماڵەیەکی فەیزوڵڵابەگی کە زۆربەیان هونەرمەندن ، لە دایک بووم .

لەمنداڵی یەوە کە چاوم کردەوە خۆم لە نێو کانوونێکی هونەری ناسی و باوکم بە چەندین ساز شارەزا بوو و جارجاریش گوتنی دەگوت . بەش بەحاڵی خۆم زۆرم کەلک لێ وەرگرت .

ـ ئەنگیزەی هۆگریت بە مۆسیقا چ بوو ؟

بەداخەوە چاوم زەعیف بوو یانی نێزیک بین بوو . ئەوە هۆیەکی گەورە بوو بۆ ئەوە کە نەوتێکی زۆر بەگڕی بەتینی بیروهەستمدا بکرێ. چون خۆم لە ڕەفیقەکانم بە کەمتر دەزانی لەم رووەوە پەنام دەبردە بەر شتێک کە تەنیاییم بتارێنێ . .

دیسان بەمنداڵی کە هێشتا تەمەنم نەگەیبووە جێگەیەک کە قۆرتی وەها گرانم بەسەر بێ و پێویستیم بە ئەوینی دایک بوو ، دایکم ئەمری خودای بەجێ هێنا . نەبوونی دایک و کەوتنە بەر دەستی زڕدایکی خەراپ وێڕای کەم سوێ بوونی چاوم دەستیان وێک داو ئاگری دەروونیان بلێسەدارتر کردم .

لەم لاشەوە زەمانێک کە پێویستیم بەباوک بوو یارمەتیم بدا و خەمی گرانم لەسەر

هاسان بکا خوای تەعالا ئەویشی لێ ستاندم . گەرچی لەماوەی ژیانیدا لە هیچ حەولێک سەبارەت بەمن دریغی نەکرد .

ئەو مەبەستەش هێندەی دیکە منی تەنیا و بێکەس هێشتەوە .

زەمانێک کە وەختی ئەوە بوو لە شاری خۆم و لەنێو خزم وکەسی خۆم بمێنمەوە ، نەبوونی کارو نەبوونی پوولْ ناچاری کردم خزم ودۆست تەرک بکەم و روو بکەمە ورمێ ولە شانۆ کار بکەم .

بەلام ئەوەی من لێی دەگەڕام لە شانۆ دەست نەدەکەوت . ئەم هەرێمە پاکەی لە زەینمدا بوو ئەوێ نەبوو .

ناچار رووم کردە رادیۆتلەویزیۆن و لەوێ دەستم بە کار کرد.

بێکەسی و بێ مشوورخۆری بەلایەکی گەورە ـ تری بەسەر هێنام . بۆ یەکەم جار زەماوەندم کرد بەلام بێ ئەزموونی و خاوی کارەساتێکی بەسەر هێنام کە زەبرێکی گرچووبڕ بوو لە ژیانمدا .

کەس نەبوو نێونجیمان بکا و ئەم شەڕ و کێشانەی لە چوارچێوەی مالْمدا بوو لەگەلْ خێزانم چارەسەر بکا ، خێزانم تەلاق دا و ئەوەش دیسان دەردی سەر دەردانم بوو

بەلام سەرەڕای هەموو ئەم کەند وکۆسپانە کۆلم نەدا ودرێژەم بەمۆسیقادا . چون دەمزانی لەم رێگەوە دەتوانم خزمەت بەخەلک بکەم .

ئێستا مالْم لە سەقزە . کارمەندی ئامووزش و پەروەرشم . دیسان زەماوەندم کردۆتەوە و ئەو کەموکووڕی و بەتالایی یەی باسم کردن تا رادەیەکی زۆر کەم بۆتەوە .

بەلام لەباری مادی یەوە ،ئێستا جێگای خۆم نەگرتۆتەوە . لە مەزیقەدام ، ئەگەرچی ناتوانێ کۆسپی رێگای هونەرم بێ.

کلاسی دەرسی مۆسیقام هەیە و شاگردیشم هەن . زۆرم پێ خۆشە تا نەمردووم و ماوم و لە توانامدایە ، چەند کەسی دیکە بە کۆمەلْ بسپێرم تا دوای من ئەوان بە شوێن هونەری ئەم ولاتەدا بگەڕێن و نەیەلن بکەوێ وبخەوێ و لەنێو بچێ .

لە لایەکی دیکەشەوە ئەوەی لەپاش من بە یادگار بەجێ دەمێنێ ئەو شاگردانەن وبەس .

ئەوجار دەمەوێ ئەوەی من دەیزانم لە ئیختیار خەلکی بنێم .

ـ ئیشارەت بەکاری هونەری کرد . دەکرێ لەو بارەوە پتر بدوێی ؟

بەرجی سازلێدان ، جارجار بۆ دلی خۆم و دۆست و هاوالان دەخوێنم . دۆستان نەزەری لوتفیان هەیە و نەوارەکانم رادەگرن . خۆم ویلۆن لێدەدەم بەلام ئاکاردۆن و زەرب و فلووت وسازەکانی دیکەش لێدەدەم و پێم خۆشە باری زانستی مۆسیقای خۆم کاملْ بکەم.

وەختێک دەتەوێ ئاهەنگێک دابنێی یا هەستێکی هونەریت هەیە لە چ بارێکی روحی دای و ئەم هەستە چۆن دەردەبڕی ؟

بەشەر فەرامۆشکارە . جاری وایە رابردووی خۆم لەبیر دەبەمەوە و دلم خۆشە . جاری واشە بە وەبیرهێنانەوەی رابردوو پەرۆش دەبم و هەستم وەجۆش دێ .

من لە زۆر خۆشی ژیان بێ بەش بووم لە تەمەنی پڕ کارەسات و بەسەرهاتمدا ئەوەی

وەبیرهێنانەوەی بۆ من مایەی شادی یە تەنیا هونەرە .

وەختێک ساز بۆ دڵی خۆم لێدەدەم یا بۆ دڵی خۆم دەڵێم ، بێ شک تکەی ئەسرینم وێڕای سازەکەم شین گێڕی دەکا .

لە چ سەبکێکی هونەردا کار دەکەی ؟

پێم خۆش نیە خۆ مەحدوود بکەم . هونەر سەبکی خۆی دەبینێتەوە و جێی خۆی دەکاتەوە .

بۆ زیندووکردنەوەی نۆتی مۆسیقای بەیت چت کردووە ؟

ئەوە ئەرکی سەرشانی هەموانە . هەر گەل و نەتەوەیەک رێ ورەسم وداب وشوێنی رابردووی خۆی بپارێزێ .

پێم خۆشە ئەوەی لە رابردوودا بوومانە زیندوو بێتەوە . زۆربەی کاری هونەری خۆم بۆ فۆلکلۆر تەرخان کردووە بەڵام ئەوە بەو مانا نیە کە ئاموێ ئاگام لە زانست و پێشکەوتی مۆسیقا بێ بەڵکوو سەرەڕای کار کردن لە بەشی فۆلکلۆر ، لە بەشی کلاسیک و نوێشدا کار دەکەم .

– ویلۆن چۆن فێر بووی ؟

لە سەرەتاوە ویلۆن بەدەست مامۆستایەک بوو بەناوی کاک حامید تەوحیدی کە خەڵکی شاری سەقزە .

یەکەم جار دەستەوداوێنی باوکی خوالێ – خۆشبووم بووم تا بمنێرێتە خزمەت ئەو . باوکم داوای لە کاک حامید کرد و ئەویش هات بۆ ماڵی ئێمە و وردەوردە فێری کردم . دوایی کلاسی دانا و کلاسەکەش لە ماڵی ئێمە نێزیک بوو. قەتم لەبیر ناچێ هەوەڵ گۆرانی یەکی فێری کردم ئەسمەر بوو . .

دوایی بەهۆی کەم بوونی شاگرد کلاسەکەی بەست. چون خەڵک کەمتر سەرنجیان دەدا بە هونەر .

کەهاتمە ورمێ لە خزمەت کاک سمایلی شاهی و کاک قادر سەیاحی یادیان بەخێر بێ درێژەم بەنۆت دا و هێندێک مامۆستای گەورەی مۆسیقا لە تاران یارمەتی یان دام و ئاخرین پلەی مۆسیقام بەرێوەبەری تیپی مۆسیقای مەهاباد بوو ساڵی ١٣٥٣ .

ئەم دۆست و مامۆستایانەم یادیان بەخێر بێ و لە هەر جێگەیەک هەن سەرکەوتوو بن .

– بە بڕوای تۆ هونەر چیە ؟

هونەر زادەی روانینی بەشەر و ئیحساسی دەروونی ئەوە . چون تۆ هەر هونەرێکت بێ بەو هونەرەهەست و کوڵی دڵت دەردەبڕی .

وەختێک مەدحی پێغەمبەری مەزن (د.خ) دەکەم دەڵێی ئەوەیە کە خەیاڵی ئەوم لە دڵدایە و وەک دەروێشێکی پاک ئەوم هاتۆتە بەر نەزەر .

یا لەگەڵ دۆستێک دادەنیشم خەبەرێکی خۆشم دەداتێ حاڵەتی دەروونم بۆ بەیانی ئەم خۆشی یە جیاوازی هەیە لەگەڵ وەختێک کە پەرۆشم .

– هونەرمەندی راستی کێیە ؟

هونەرمەندی بەراستی کەسێکە ئاگای لە دەردو مەرگی خەڵک بێ . جا وەختێک دەتوانێ ئاگاداری دەردی خەڵک بێ کە چێشتبێتی .

هونەرمەندی بەراستی ئەوەیە هونەرەکەی لە خزمەت چین و توێژێکی تایبەتیدا نەبێ .. هەموو کەس بە قەت توانست و بڕشتی خۆی کەڵکی لێ وەرگرێ .

# چاڵە گورگ

خ - میرسید

چاکم لەبیرە لەساڵانی رابردوو لەو ناوچانەی کە زوو دەگەنە ئاو وەک : شار ویران ، شامات ، سندووس ، چۆمی مەجیدخان ، **چاڵە گورگیان** هەڵدەقەند .پیاوانی دێ بە تایبەت لاوەکان پێمەڕە وکوڵینگیان هەڵدە- گرت و وەمەزرا دەکەوتن و شوێنێکیان بەدی دەکرد کە گورگ زۆر هات و چۆی پێدا کردبا و دەستیان بە هەڵقەندن دەکرد .چاڵەکەیان خڕ دەردێنا کە قوترەکەی ٣/٥ میتر دەبوو .نێرکێکیان لە نێوەراستی چاڵەکە دەهێشتەوە و بەو شکڵە درێژەیان بە هەڵقەندن دەدا ، تا دەگەیشتە ئاو ، ئەوجار دەستیان لێ هەڵدەگرت و دەهاتن کەلاکێکیان لەسەر نێرکەکە دادەنا و بەقامیش تەنک دایان دەپۆشی ووردە پووش پەلاشیان پێدا دەدا ، تا ئەگەر ویستی بۆ لای کەلاکەکە بچێ نەسلەمێتەوە یا زۆرجار دەهاتن بزنێکی وشیاریان لەسەر نێرکی چاڵەکە دادەنا و هەر چوار لاقیان دەبەست .ئەوکارەیان بەشەو دەکرد. بزنەکەش کە هەستی بە تەنیایی دەکرد دەی بێراند ، گورگیش وەدووی دەنگی بزنەکە دەکەوت . لەپڕدا پێی لە سەر قامیشەکە دادەنا و دەکەوتە نێوچاڵەکە . چونکە لە ئاوەکە دەکەوت و تەر دەبوو نەیدەتوانی بە دیواری چاڵەکە هەڵبچێ .بە ناچاری شەکەت وشەلاڵ دەبوو و تا بەیانی دەماوە .

بەیانی زوو چەند کەس بۆ سەردانی چاڵەکە دەچوون کە دەیاندیت گورگ دەچاڵ کەوتووە ،بەغاردان دەچوونەوە ئاوایی و خەڵکی دێ ورد و درشت بەرەو چاڵە گورگ وەڕێ دەکەوتن.

لەپێشدا چەند پیاوی دەنێوەوەچوو راوێژی دەرهێنانی گورگیان دەکرد چون لە لاوەکان کارامەترو لێهاتووتر بوون، گوریس یا کەندریان دێنا و بە قڵفە دەیانهاویشتە ئەستۆولاقی پاشان هەڵیان دەکێشاوە .بۆ ئەوەی پەلاماری جەماعەت نەدا پەتیان داویشتە سێ لاقی، تا ئەگەر رامالێ بردە لایەکی ئەوی دیکە بیکێشێ و نەهێڵێ . بەو شێوە گورگیان بۆ نێو ئاوایی رادەکێشا و لە مەیدانێک رایاندەگرت و هەچی هاتبا بەردێک ،تفێک یا جنێوێکی داویشتێ . کوتەک وراپسان داپسانیش لەوێ راوەستێ .

پاش ئەو هەموو جەزرەبە و کارەساتە سەگی ئاوایی- یان وەسەر دەگێرا ا لە ئاکامدا بە شێوەیەکی زۆر نالەبار دەیان تۆپاند و کەلاکەکەی بۆ ماوەی چەند رۆژ لە قەراغ دێ لەسەردوو داری دوو لک ، چوارپەل لە حەوا دەماوە و گاڵتە و گەپیان پێ دەدا ا

دوای چەند رۆژهەڵاوەسین دەیان هێنا خوار و لاقیان لە ئەژنۆ بەرەوخوار ، دەبڕی . بەبڕوای هێندێک ژن ، لاقە گورگ بۆ ژانە مەمک دەبێ . یا هێندێک لاو بەدزی جگەکانیان دەر دێنا . بەبڕوای کۆن جگە گورگ بەختهێنەرە ، یانی هەر لاوێک جگەگورگی پێ بایە بەختەوەر دەبوو. هەر چەند ئەو مەسەلانە بۆمن وزوربەی زۆری خەڵکجێی بڕوا نین بەڵام چونکە بەو شێوە رەفتاریان لەگەڵ گورگ دەکرد منیش بە پێویستم زانی ، باسی بکەم .

# لەگەڵ شیعری ش

پێنجوێنی

سنوورەکەم
وردیلانە بچکۆلەکەم
تۆ بنێرەوە
بەڵێنی بێ ، گەر بنێیەوە
بەزمی گوڵان بۆ یەک بگرین
پەنجەی تەزیو
لە ئاسمانی خەم وەردەدەین
بۆ زارۆی شیرینی خەیاڵ
پاوانەیەک لە ئەستێرەکان چێ دەکەین
فرمێسکی چاوی ئاڵەکۆک
بۆ دوا بەفری بەری بەهار
دەکەین بە جام نۆشی دەکەین
بەڵام سنوور ... ماتە دڵم
خامۆش و بێ وازە دڵم
زەوی یەکە ئاو نایشواتەوە
ئاسمانەکەی وەک چاوی ماسێکانی ئاو
ساف و سپی دەچێتەوە
لە بەختی ڕەش
پەڵە هەورێکی چڵکنیش
ئاگری بە کوڵ بەسەریدا
ئاگری ئاگری بە سەریدا

ع- ڕێبوار

من لەنێو تۆزی شەماڵا گوم بوو
لە پاڵ خەرمانی غەما پاڵ کەوتوو
شەماڵ وزریان ئاور تێ بەربوو
ئاساز دەهاتن بای شەنم نەبوو
داما بووم بەدەست خەرمانی غەمدا
بە لووتکەی کێوی سەختی ماتەمدا
خەرمان سوور نەکرا هەرما کاودان
شەوتا کوو بەیان هەرئەتلام بەژان
هەوری پەژارە دەهات بە سەرما
جلکی غەمباری دەکرا بە بەرما
دەمگوت خەرمانم ئەمساڵ بەجێ ما
بای گەلاڕێزان دەکشێ بەسەرما
شەماڵ وەک شێتان زریان وەک هاران
نەمماوە قەرار کوا بای خەرمانان ،
سواڵیش بۆ خاوەن کشت وزەرعوزار
عەیبە ئەی خودای خالەقی جەببار
ئەم کە بای بێ، خەرمانم کەم شەن
چاسڵێ هەڵگرم نەمێنێ تەشەن

جەعفەر شێخول ئیسلامی

دەستم بگرە !
لەرێگەی پڕ کەندولەندی
هەوڵی سەخت بۆئینسان بوون.
بەتەنیایی
هەر کەندا لێک هەڵدێرێکە ،
دەستم بگرە !
با بیکەینە پێخۆری پێ
گشت هەورازی رژدی سەررێ.
دەستمبگرە !
دەستت دەگرم
بەدوو دەستی وەفا وئەوین،
بۆئینسان بوون
بۆمانادان بەبوون وژین.

لەوفکرەدا بووم خەوم هاتە چاو
نەمزانی شەوە هەورە یا نەساو
بە پێچەوانەی شەوگاری پێشوو
لە خەو راپەڕیم ئەمشەوگەلێ زوو
چون "سروە"ی بای شەن دای لەنێوچاوم
ئاوپرژێنی کرد دڵی ژاکاوم
شەوی تاریکی لێ کردمە رروونی
دەرچووم لەماتیووغەمو زەبوونی
ئەوسروەی کەمن لەدووی دەگەڕام
هات وبەهاتنی دڵ گرتی ئارام
لەتەپ وتۆزو خەفەت بووم نەجات
خەرمانم شەن کرد گەییم بەئاوات
یاخوا ئەم "سروە"هەرپایەدار بێ
پشت لەزاڵمو روو لەهەژار بێ

# ک.د.ئازاد

گوڵە نەوروزە

هاورێم
دیسان پێدەکەنم
دیسان قاقای پێکەنینم
لە چیا دەنگ دەداتەوە
دیسان لەناو بەختەوەران
شیعرم جێی خۆی دەکاتەوە
بەڵام
شیعری ئەمجارەی من
بۆ رواڵەتێکی جیاوازە
شیعرم لەسەر چەمی خەفەت
بۆ گشت کەسی پردەبازە
شیعرە جیهانێکی ترە
دەدرەوشێ وەک پیرۆزەیەک
لەسەر گۆڕی خەیاڵەکان
دەروێنێ گوڵە نەورۆزەیەک

# ئاسۆ

دڵێ بۆ دینی گوڵ شەیدا نەبێ ! هیچ
سەرێ سەودای ئەوینی تیا نەبێ ! هیچ
دەڵێن پیر بۆ ئەوین ریسوایی یەکە
کە پیرێ بۆ ئەوین ریسوا نەبی ! هیچ

# کاکەلاوی پشدەری

سروە سروەی تازەنینم
هێزی دل ئاواتی ژینم
کە هێمن سەری نایەوە
پێموابوو هەتیو مایەوە
بۆت گریام ،خەمم بوخواردی
بۆم کێشای هەناسە ساردی
بەڵام سپاس بۆئەو خوایە
کەوا پێی داوی دەسمایە
روونە لەلای هەر ئینسانێ
پالەی چاک داسی دانانێ
سروە گیان تۆ بێ زمانی
جێگەی هێمنیش نازانی
بەڵام منی ئاوارە
ئەو بی کەس و دەردەدارە
هەر دەرفەتێکی بۆم بلوێ
لێرە، لەوێ یا لە هەرکوێ
دەچمە سەر گۆڕی پیرۆزی
دەکەم بە کل خۆڵ و تۆزی
دەڵێم "هێمن" موژدەم دەیە
"سروە" هەروا لەنێو مەیە
موژدەم دەیە شاعیری کورد
نە تۆ دەمری،نەسروە مرد

# شاعیرانی لاو

# ک.د.ئازاد

لێم ون بوو ئیتر خۆری ژیان ، بەختی گەشم
داماوە لە ژیرباری خەمان پشت و لەشم
تاج و کەمەری خوسرەوی شەیدام چوو لەدەست
خەرمانی غەم و هێزی کەم و ژانە بەشم
وتیان کە رەش رەنگی هەرە بەرزە وتم :
ئەی بۆچی سپی زاڵە لەسەر مووی رەشم

**شنۆ : کاک زورار پەیغامی**

تکات لێدەکەین شیعری شاعیرانی بەناوبانگی کورد بەناوی خۆت بۆئێمە مەنێرە

ئەم شیعرەی دواجار ناردووتە شیعری حاجی هاشم نانەوازادەیە و محەممەد مالمێ بەگۆرانی گوتوویەتی ئەویدیش هەر قەتارێکی قەدیمی کوردی‌یە کە ئاوا دەست پێدەکا :

" توفیق بدەی پێم رب العالمین "

**مەهاباد :خوشکە سوهەیلا بلووریان**

شیعرەکەت سۆزی شاعیرانەی پێوە دیارە .بەڵام وا دیارە تازە دەستت بە شیعر گوتن کردووە و شیعرەکانت هێندێک لاوازن . بەموتالای پتر بە تایبەت کتێبی " نقدالشعر" دەتوانی لەوە پتر لە شیعردا سەرکەوی .

**سەردەشت : کاک مەجنوون**

دیاری یە جوانەکەت گەیشت . " بیلندانە " رەسمێکی کۆنی کوردەواری یە تکایە لە جیاتی شیعر بە نووسراوە بۆمان بنووسە و زۆر بەوردی هەرچی لەو بارەوە دەزانی بیهێنە سەر کاغەز تا چاپی بکەین و خوێنەرانی بەرێز لەم بارەوە پتر شارەزابن .

**سەردەشت : رەحمان مەلایی**

برای بەرێز ،بەراستی لە بەرامبەر ئەو هەستە پاکەی تۆ و خوێنەری خۆت ئاسایی قەڵەممان کوڵ و کۆڵە .هەر ئەوەندەی خاوەنی ئەو هەستە پاکەی بۆ ئێمە گەورەترین پاداشە . خوا راوەستاوت بکا .

دەتوانی بە خوێندنەوەی کتێب و نووسراوەی کوردی فێری خوێندن و نووسینی کوردی بی . هیواداریـن سروەش بتوانێ لەم بوارەدا یارمەتیتان بدا وبە کەلک بێ .

**ورمێ : غەریب مەزهەر**

سووژەی جوانترهەڵبژێرە خۆی پتر پێوە ماندوو بکە دەتوانی چیرۆکی زۆر لەوە باشتر بنووسی .

چاوەڕوانی بەرهەمی جوانترین .

**سەردەشت :قادرمامحوسێنی**

شیعرەکەت لاساکردنەوەی بەهاری "وەفایی"یە هەر لە سەر ئەو وەزن و قافیەشە . وەختێک شیعر دەڵێی بابەتێکی نوێ بەشێوەیەکی شاعیرانە لە شیعرەکەتدا باس بکە .

**سەقز : ئیرەج .ج. هەژار**

شیعری "شارەکەم"کە بۆت ناردووین عەیبی تێدا دەبیندرێ . وەک : بۆچوونی هەڵە لە مانای وشە .

ناوبانگی جوانی دیمەنت دەنگی دابوو لە گشت
جیهان
تۆ ناسرابوو لە گشت
لایی
بەنێوی شاری شارەکان

"دەنگ دان" بە مانای دەرکردنە . دەڵێن فڵانە کەسیان دەنگ دا یانی جوابیان کرد ،دەریان کرد تۆ رەنگ بێ مەبەستت دەنگ دانەوە بێ یانی تەنین بەڵام ئاوا کورتت کردوتەوە.یا

دەوەرە تاکەی بەخونچەی
من چاوەرێت بم
تاکەی بە ئینتیزار
قاسیدی سەررێت بم!

چاوەڕوانی هاوکاری پتری ئێوەی ئازیزین .

**بۆکان : یوسف مستەفا**

بەڵێ مامۆستاهێمن زۆر شیعری بڵاونەکراوەی هەیە کە بەدەست خەڵکەوەن.ئەگەر رۆژێک بتوانین وەکۆیان بکەینەوە چاپیان دەکەین ـ بە بڕوای ئێمە تۆ

# ئەدەبی

قەڵەمێکی جوانت بۆنووسین هەیە . لە نامەکەت وا وەدەردەکەوێ جوان دەنووسی بەڵام شیعرەکانت لاوازن . هێندێک جار ماناشیان نیە وەک ئەم شیعرە :

دەچم دەگەڕێم لەنێو
باخی ژیان
بزانم خۆشیم بۆدێتە
کەوان

لەم شیعرەی دیکەشدا ، تەعبیری شاعیرانی دیکە زۆر بە ئاشکرا دەبیندرێ .

ژیانم پڕە لە نامرادی
نەمدیوە جارێک دڵخۆشی
و شادی

ئەوە هەر ئەو شیعرەی مامۆستا هێمنی رەحمەتی یە :

ژیانم پڕ لە ڕەنجەو
نامرادی
بەهەڵکەوتیش نەهاتم
تووشی شادی

سنە : **خوشکە مەهناز کاوسی**

بەڵێ دەتوانی چیرۆک بنووسی . تێ بکۆشە کوردی نووسین فێربی ونووسراوە ـ کانت بەکوردی بنووسە ئەگەر نەت توانی بە فارسی بینووسە . ئەگەر نێوەڕۆکی چیرۆکەکە ، باش بێ وەری دەگێڕین و لەچاپی دەدەین

بۆکان : **ئەبووبەکر خاڵندی**

پێشنیارەکانت جوانن . خوا یاربێ لە ژمارەکانی داهاتوودا وەبەرچاویان دەگرین. نموونەی شیعرەکەت ناردووە، زۆر لاوازە ئەگەر چیرۆک بنووسی باشترە. وەکی چەندجار رامان گەیاندووە ئەدەب تەنیا شیعر نیە بابەتێکی دیکەی ئەدەبی رەچاو بکە و لەو رێبازەدا کار بکە. سەرکەوتوو بی .

بۆکان : **حەکیم فەیزی**

براگیان گلەییت کردبوو کە شیعرەکانم بۆچاپ ناکەن هۆیەکەی ئەوەیە کەبەهۆی لاوازی شیاوی بڵاو کردنەوە نین . ئەدەبی کوردی هەر لە شیعردا نەبڕاوەتەوە دەتوانی بارەکانی دیکەی هونەر رەچاو بکەی و سەر کەوتوو بی .

شیعری ئەم جارەشت عەیبدارە لەباری وەزنەوە رێک نیە بەڵام بۆ ئەوەی بە راستی لێت مەعلووم بێ بڕوانە ئەم شیعرەی خۆت :

دەوەرە ئەی گوڵی هیوا
خۆت بنوێنە
رەونەقی بازاری دەرک
بشکێنە ! !

شیعری ئەم ئازیزانەشمان پێگەیشتووە . یا لە باری وەزن و قافیەوە کەم و کووڕی یان هەیە ، یا لەباری نێوەڕوکەوە کزن . سپاسی هاوکاریان دەکەین و هیواداریین پێوەندی خۆیان لەگەڵ سروە گەرمتر بکەن و بە موتالای پتری شیعری شاعیران شیعری جوانترمان بۆ بنێرن .

**عەبدولکەریم سرووش ـ رەحمان نەبی پووریان کەمال کەریمی ـ رەسووڵ قەڵاتەڕەش ـ عوسمان محەممەد دیاکۆ ـ عەزیز شێخی ـ سابیر ئیبراهیمی ـ ناسر ئەحمەدی عەزیز نوشیروانی ـ محەممەد ئیبراهیم خاسە ـ ئەسعەد ژیان ـ سەعید عەبدوڵڵا مراد خان ـ فەتاح عەبدوڵڵا پوور ج.ر. تێنوو ـ قادر ئەحمەد بەگی ـ سیدخدر میر سەیدی سەلاحەدین ـ محیەدین سالمی عومەر زیرەک ـ محەممەد یوسفی ـ لوقمان موتاعی عومەر کەریمی ( غەریب ) الف ، رزگار ـ کەریم عەبدی پوور ـ غەمبار مازگەیی سەید خالید حوسینی مەحموود مەحموودی ـ سەید جەمال کەریمی ـ رەحیم خرپە ب.ا. شیروکی ـ م.ک. سەر شیوی ـ ئیبراهیم .ب ـ سەید ئەحمەد دڵپڕ ـ ئەسعەد ژیان**

«رووتەڵە»

# سەرولاق

شەش ساڵ بوو ژنم هێنا بوو بەڵام منداڵمان نەبوو وردەوردە دەهاتم پیربم ئەڵبەت ئەوەندەم ماڵ وسامان نەبووبە میرات بەجێ بمێنێ و خزم وکەس لە سەری تووشی هەڵلاێ بگربن وئاکامەکەی تەقە لەقەبرم .ئیدی نالێم چۆن دەژیام وچەندم هەبوو تەنیا دەڵێم کارمەند بووم!

ئەوەی منی زۆر دڵگیر کردبوو نەبوونی منداڵ بوو وەختێک لەماڵی خزمو دوستان بانگ دەکراین ، پێم خۆش بوو منیش منداڵێکم بەباوەشەوە بێ، بەدارو دیواری ماڵ هەڵڕووسکێ. هەرچی بێ هەر منداڵ بێ جابا ئاورم لەسەر پشتی بکاتەوە!

پاش ملەوبەرەورووزۆران باسیان دەکردم .ئەوەش هێندەی دیکە نارەحەتی دەکردم .

نازانم لالانەوەی خێزانم بوو یا خۆزگە وبریای من پاش حەوت ساڵ چرای ماڵەکەم گڕا .ماڵم تینی تێگەڕا .چاوم روون بووە .جحێڵ بوومەوە خواکچێکی دامێ .

هەر ئەوانەی تۆپ و تەشریان پێدا دەدامو لۆمەیان دەکردم پاش حەوتووی منداڵ وەک شلغەمێش دەورەیان دامو ویستیان ناوی بنێن. بریا هەموو رووداوەکەم لەبیر بایە تابزانن چم چێشتووە!

ناوی وایان دەدیتەوەهیچ قاموسێک نەیگرتبوودەستەیەک پیاوبەبیستنی زەندەقی دەچوو ، پۆلێک نەخۆشی و ئازاری وەبیر دێنامەوە دەستەیەکی دیکەبۆنی سیاسەتی لێدەهات .یانی هەرئەوشتە کە بەدرێژایی تەمەنملێی تۆقیوم وبەتێتووی تفەنگیش ناوێرم تخوونی بکەوم... بەڵام ئەوان بێکاروبێبار بوون وچێشتی مالی کارمەند زۆر وزەوەند کەس لە منی نەدەپرسی. جاری وابوونیوسەعات هاواری چۆڕە ئاوێکم دەکرد ئاخری ناچار دەبووم بۆخۆم هەستم .

ناونانی منداڵی بەستەزمان ببووە گرێ یەکی گەورە کەبە کەس نەدەکراوە من بەوەڕازی بووم زووناوی لێ بندرێ ولەم کێشەو هەرا " کۆنگرە " و" کۆنفرانس "ە رزگارم بێ بەڵام کەس ڕای ، کەسی نەدەسەلماندو هەرکەسە کاندیدای خۆی پێ لەوانی دیکە باشتر بوو .

پاش " کۆبوونەوە "و"شووڕا "ی چوار رۆژە" بڕیارنامە" دەرکراو بنی مۆرکرا و نێوکی بڕا ئەویش لە پوورەنازێ دەزانم .لەماوەی "رەسمی" بوونی جەلەسەدا متەقی لەبەرنەهات . لە ئاخریدا هەڵێدایە!

ئەمکچە ئەو ماڵەی رووناک کردۆتەوە . هیوا و هومێدی بە دایک وبابی داوە وتین وتاوی ئەم ماڵەیە جاکەوابوو ناوی بنێن " تروسکە " جلەسە کۆتایی پێهات ولێکرا گوتیان:

ـ بەدایک وباب گەورەبێ ناودێربێ. خودابرای بداتێ ئەم مەسەلە بەخێروخۆشی

دوایی هات بەڵام تروسکەی
چارەڕەش ئەوەندە هەڵگێر
وەرگێڕ کرابوو بڕای ببڕ
مەمکی نەدەگرت. هەمووفێڵ
وحیسابی قەدیمی لەسەر تاقی
کراوە بەڵام مەمکی لێ بوو
بەڕمووزنە، هەرچی کردمان
نەیگرت ونەیگرت.

" دێوکەم بوو لە
دێوەڵانێ یەکی دیش هاتەسەر
کەندەڵانێ" منی فەقیر لە
نیوەی مانگەوە چاوم لە
سەعات بوو ودەقیقەم دەبژارد
ـ ن داخواکەنگێ هێلالی مانگی
نوێ دەبینم! ئەوجار
" هەزینە"یەکی پێش بینی
نەکراو و"بووجە"بۆدانەندراو
هاتبووە ڕێزی خەرجەکانەوە
دەبوو شیری وشکیش بکڕم. بەڵام
مەگەر دەکرا منداڵی
بەستەزمان لەبرسان بکووژم
ناوی خودا و پێغەمبەرانم
هێنا وبەرەو دەواخانە وەڕێ
کەوتم. هەرکە گەیشتمە ئەوێ
بەکابرام گوت:

ـ برالە قوتوویەکم
شیری چاک بدەیە!

ئەویش بێ یەک و دوو
قوتوویەکی شیر بۆ هێنام
وێنەی منداڵێکی خەپەتۆڵەی
لەسەربوو.

شیرم بۆتروسکە هێنا و
گرتمانەوە. وەک برسی ساڵی
گرانی هەر ئەوەندەبڵێی یەک
ودوو هەڵی هاویشت ....

مانگێک ڕابرد. تروسکە
دەهات وهەڵیدەدا. شیری وشک
پەیماتی "گیرفان هەڵتەکاند-
نی" منی دابوو وتروسکەچاوی
پشکووتبوو. وردە وردە وەبە
چە بنیادەم دەچوو.

ئێوارەیەک خێزانم گوتی!

ـ هەستە بڕۆ شیری بۆبکڕە
نەیماوە.

دیسان چوومە دەواخانە
وداوای شیرم کرد. بەڵام،
نەبوو. ناعیلاج کەوتمە
ڕاوێژو تەکبیر. ئاکامەکەی
بووبەمەکە جۆرە شیرێکی
دیکەوەربگرم.

شیری تازەم هێناوە. بەڵام
تروسکە وەک بەهەزاران فێر
کرابێ "ئیعتیساب"ی کردوو
دەمی لە شیر نەدا. ئەو شەوە
مردووی قەبرستان هەندران
من نەهەندرام. هەرچی کردم
نەمتوانی ئیعتیسابی غەزایی
تروسکە بشکێنم وشیری
دەرخوارد بدەم.

سەر لەنوێ شیرم گۆڕی
یەکی دیکەم هێناوە. ئەوی
پێ نەکەوت سەرت نەیەشێنم
کارم بوو بە ئاڵ وگۆڕی شیری
وشک. ناوی هەموویانم لەبەر
بوو. خاسێتی هەموویانم
دەزانی. نەخۆشی منداڵی
دۆست وبرادەرانم بە هێی
ئەوشیرە کە دەیانخوارد،
دەناسی.

هەرچۆنێک بوو نەمرنەزی
تروسکەم تێر کرد، بەڵام
ڕۆژێک ساغ وچواران نەخۆش.
دوکتۆرو مونشی تروسکەیان
دەناسی وهەرکە وەژوور،
دەکەوتم دوکتۆر بێ ئەوە
چاوی لێ بکا دەیگوت:

ـ شیرەکەی بۆ بگۆڕە.

جارێک پاش ئەوەکە تروسکە ٨
مانگە بوو برد مەلای دوکتۆرو
پێم گوت:

ـ جەنابی دوکتۆر ئەم کچە
گیرفانی هەڵتەکاندووم بەڵام
هەروا ئیشک وڕەقە هەرچەندی
چاوم پێی دەکەوێ دەڵێی تڵتە
گێزەرە ئاویان لێ گرتووە.

ـ شیرەکەی بگۆڕە.

ـ کوڕە شیری چی؟ زگی
تروسکە وەک " لوولەی ئازما-
یشگا "وایە هەر چەشنە
شیرێکی لەسەر تاقی کراوەتەوە
بەڵام بێ فایدەیە:

– عەرزم کردی شیرەکەی بگۆڕە !

– جەنابی دوکتۆر مەردی خودا بە. دەرزی ودەرمان بەو هەرزانی یە. کوڕە هیچم بە جەرگەوە نەماوە چاری ئەم منداڵەم بۆبکە:

– ئەها دیتمەوە .خۆراکی بدەیە:

بە بیستنی ناوی خۆراک شاگەشکە بووم .بەلەزوبەز "تەجزیەوتەحلیل"م کردوو دیتم زۆر بە قازانجە .ئەوەی من وخێزانم تێر دەکا ئەویش بەو قایل بایە هیچم نەدەویست .دوکتۆر درێژەی بە قسەکانی دا وگوتی:

– بەڵێ دەبێ خۆراکی بدەیەی. سریلاک زۆرباشە.

دیسان ڕیس بۆوە خوری

بیستنی ناوی سریلاک هەموو مووی بەدەنم بوونە نەشتەر چون ئێستا لەشیرکڕین

نەبیوومەوخۆراکیشی هاتە سەر.ئەم دەردەکە بەشیرەوە دیم بە خۆراکیشەوەدیم.یەک قەبزی دەکرد.یەک ڕەوانی دەکرد. یەک ئیشتیای نەدەبر – د، یەک وەدەست نەدەکەوت ئاخروئاقیبەتی جاڕز بووم من ڕۆژ لە ئیدارە بووم و شەوانە "ئازار" و"ئەشکەنجە" دەستی پێدەکرد. بەڵام دایکی چارەڕەشی بەشەو بەرۆژ"شەڕی ڕەوانی" دەکرد.چەندی شەو و شەو نەخوونی کێشا! چەندی شەوزیندەداری کێشا. چەند جاری دەسرازەلێ شل وتوندکرد هەرخودا دەزانێ. بەدیتنی ئەودیمەنانەبوو کە دایکی کلۆڵم سەد هێندەی جاران لە بەر چاو شیرین وبەڕێز بوو. بە ڕاستی دایک چ دەکێشی ؟

ئەوجار بەمەدەردوداخەوە چەندم دوعا کردبوو خودا! منداڵن بداتێ دوو ئەوەندە دەپاڕامەوە بیباتەوە. بەڵام دوعای ڕەشکاری لێ نەکرد و تروسکە هەرما.

مەسەلەی پێشنیان درۆنیە بەڕە هەر لەلای تەنکەوە دەدڕێ منداڵەکەشم دەیزانی من زۆرا تێرو پڕم ئیشتیا بۆ خۆراکی هەرزان بایی نەدەچوو.تەنیا یەکیانی پێدەکەوت ، ئەویش پاش ماوەیەک لە دەواخانە قاتبو و چووە پشتی شێران . ئەمجار مامەوە منی مافنگی و تروسکەی برسی !

نەمدەزانی چ بکەم؟ شەوێک تابەری بەیان بیرم کردەوە بەڵام بێ ئاکام بوو تروسکە هەموو چەشنەهێرشێکی بەرپەرچ دەداوە وهەموو پیلانێکی لێ تێک دەدامەوە یانی خۆراکی خۆی نەبا نەیدەویست.

بەیانی یەکی سەحەری بە نیازی فرۆشتنی تەنیا کوتە زێری قامکم کە تاقانە یادگاری من وخێزانم بوو وەدەرکەوتم .بەڵام بۆم نەدەڕەخسا ئاڵقەی قامکم بفرۆشم... بەڕاستی لەخۆم ڕانەدەدی.

پاش نیوەڕۆ برسی وماندوو بەرەوماڵ بوومەوە. چاوم لە کەوشان کرد.جووتێک کەوشی زیادی لە پێشخانەبوو.وەژوور کەوتم دیتم پورە نازێ یە. بەخێرهاتنم کرد بەڵام لەبەرم

**پاشماوەی تەنزی ...**

هەڵنەستا چون تروسکەی لێو بەبزەی! لەسەر کۆش بوو، یانی چی؟... ئەومنداڵەبۆچی وابێدەنگ بووە؟ دیتم خۆراک. دەخوا ...کێ بۆی هێنا ود؟ پوورەنازێ! خۆپوورەنازێ لەوانەنیە! ئەدی دەبێ چ باس بێ؟

– کوڕە ئەوە بۆوادامای ماڵتە خۆگەمێت لێ نوقم نەبووە!

– پوورێ گیان نازانی چ دەچێژم؟

– هیچ نیەبابم هیچ نیە هومێدبەرمەدە. خوداگەورەیە منیش پێش پێی تۆهاتم. دیتم تروسکە دەگری، دایکی دەڵێ:

– ئەوە خۆراکی لێ بڕاو، و سەرولاق وەگیر ناکەوێ.منێش وەبیرم هاتەوە زەمانێ، مە چیان دەدا بە منداڵ.

– دەی... پوورە نازێ....

دەی بەقوربانت بم...بیلێ:

– کوڕم ئەگەر دەتەوێ منداڵەکەت زوو هەڵداو ئەوە بابۆڵەی باسکی بێ ئەلەوەی بدەیە:

– ئەوەچیە؟

– چۆن ئەوەسەرولاقی تۆیە. ناڵێن وەگیرناکەوێ یان ئاخر! ئیمانتان پێ نیە چون لە قوتوو دانیەو سەری نەبەستراوە؟

– نا ...نا ئەتۆپێم بڵێ چۆنی سازدەکەی؟

– کوڕم نانی برژاو جوان بهارە. هێندێکی خاکەبەسەر وەربکەو چۆرێکی شیربەسەر هەڵچۆڕێنە. دەبێتە سەرولاق هیچیشی ناوێ؟

– ماڵت ئاوەدان بێ دادەی !!!

بەم جۆرە پوورە نازێ جارێکی دیکەش لە فریام هات وکۆتایی بە شەڕ هێنا و لەنێوان گیرفانی من وزگی تروسکە "ئاتەش بەس"ی ڕاگەیاند. وردە وردەهێمنی گەڕاوە ماڵ. جارێ وایە.بۆ داهاتووش خوداکەریمە!

**پاشماوەی جوغرافیا ....**

کە ١٣/٢ دەرەجەی سانتیگرادە زۆرترین دەرەجەی گەرما لە مانگی جۆزەردان دایە کە ٤٣+ دەرەجە سانتیگرادە ،ساردترین جێگای شارگەلازە و گەرمترین جێگاشی نەلۆسە. ساڵێ پێنج مانگ زستانە و هەواکەی کوێستانی یە کە زستانی زۆر قورس و هاوینی فێنکە. رادەی بارین (میزان بارندگی) : مانگی رەشەمە بە ٧٩/٠٦ میلی میتر بارانەوە پڕبارانترین مانگی ساڵە ومانگی خەرمانان بە ٢/٠٤ میلی میتر باران کەمبارانترین مانگی ساڵە مام ناوەندی رادەی بارین لە ساڵێ دا ٣٠٨/٩ میلی میترە و بە چەشنی موتلەق ٥٠٥/٥ میلی میترە.

زۆربەی شە (رتووبەت)ی ساڵانە لە مانگی سەرماوەز و

لە ساڵ دا ٢/٥ لە سەدە.
پێویستە بگوترێ کە مام ناوەندی شەی ساڵانە مامناوەندی حەوت ساڵەیە و ئەوانی دیکە

رێبەندان دایە کە رادەی شە (رتووبەتی) دەگاتە ٨٠% و کەمترینیان لە مانگی گەلاوێژ دایە کە ٤٧% ودەرەجەی شە

هەموویان مامناوەندی پێنج ساڵەی ئاوو هەوان.

**درێژەی هەیە**

# پەندی پێشینیان

دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە.

لەقەدەر بەڕە پێ ڕاکێشە.

ئەوەی لە شەڕ نەبێ شیری تیژە.

سوار تا نەپەڕێ نابێتە سوار.

ترسەنۆک دوو جار دەمرێ ئازا جارێک.

کێو وەکێو ناکەوێ ئادەمی وە ئادەمی دەکەوێ.

هەموو هەورێک بارانی پێوە نیە.

کەچەڵ ئەگەر دەرمانکەر با دەرمانی سەری خۆی دەکرد.

کوڕ تیرئەنگێو بێ با چاوی بابی دەرێنێ.

نان ئەونانە ئەورۆ لە خوانە.

تا ماڵ بیەوێ لەمزگەوتێ حەرامە.

پشیلە دەمی نەدەگەیشتە گۆشتی دەیگوت سوێرە.

کشە کشە، پۆپە رەشە میوان رۆژێک ودوان خۆشە

سەگ سەگی نابڕێ.

هێلکەش ناکا و راوکەش دەخواتەوە.

ئەگەر هێلکەش ناکا راوکەش ناخواتەوە.

ماڵ لە چاڵدا سێحەبلە باڵدا.

کوێر هەتا دەمرێ بەهیوای چاوە.

گاوان هەتا دانیشێ گاڕان پتر دوور دەکەوێتەوە.

خودا کێوان دەبینێ بەفریان داوێتێ.

دەست ئەگەر شکا خواری دەگرێتەوە.

بۆ دەسرەیەک قەیسەرییەک مەسووتێنە.

نە باخەوان کوڕی لەبیر دەچێ نە مار کلک.

دار هۆرەی لەخۆی نەبێ ناقەڵشێ.

هەرکەس بکا بێگانەپەرستی عاقیبەت دێنێ شکستی

بەرەی خەڵکی ئاخری دەبێ هەستی لەسەری.

بەقەت بەڕەی خۆت پێ ڕاکێشە.

تێکۆشین بەتەمای جیرانی ویشکە.

زاری بە شیری سووتاوە، فوو لە دۆی دەکا.

هەرچی لەئاشی بووئاشەوان نیە.

نان بخۆ بەلام نان دێن مەدڕە.

شتێکی فێربوی بە شیری تەرکی ناکەی بە پیری

دەریا بەجێ دەمی سەگ پیس نابێ.

تاجرێکی لەچەرگازی کابرایکی کردوگوتی:

ـ وەرەبرا ئەو سەندووقە شووشەم بۆبەرەحوجرە بەڵام لەباتی پووڵ سێ نسحەتی باشت دەکەم. کابرا سەندووقی لەسەرپشتی داناو راوستا.

تاجرگوتی: یەکەم ئەوەکە هەرکەس گوتی برسی لەتێر ئازاترە بڕوامەکە.

دووەم: هەرکەس گوتی پیادەلەسوارچوست ترەباوەڕ مەکە.

سێهەم: هەرکەس گوتی ئەو سەندووقە بێ پووڵ هەڵدەگری باوەڕمەکە.

کابراش سەندووقەکەی بەعەرزدا داوگوتی:

هەرکەس گوتی یەکی ساغی تێدا ماوە باوەڕمەکە.

.رۆژێک حەسەن نادری ڕەحمەتی قسەخۆشی مەهابادی گوتی:

جارێک لەگەڵ دۆستان قەرارمان دانا بەسەرماڵی دۆستێک دادەین. ئەویش زۆر دەستکورت ونەداربوو.

شەوێک هەستایین چووین بەخێرهاتنێکی حیسابی کردین وسەروچای لەپێشدانایین و وەدەرکەوت.

پاشماوەیەک گەڕاوە وبۆ هەموان نان وکەبابی کڕیبوو ئێمە شبەرجی ئەوە زۆرمان زگ پێی سووتا، سەریشمان سووڕمابوو. لەبەرەخۆمانەوە گوتمان:قەیدی ناکا شەوێکی دیکە دێین وبەدەستی پڕ میوانی دەبین.

پاشنان وچاهەستایین وەدەر کەوتین.ماڵ ئاواییمان خواست بەڵام کەوشەکەنمان دیارنەبوو. ڕوومان لەودۆستە کردو گوتمان کواکەوشرا!؟

گوتی:بەسەری تۆخواردتان

پاشهەوڵ وپارانەوەیەکی زۆر پێی گوتین چی لەکەوشەکان کردووە .چووبووکەوشەکانی لای حەمەعەلی کەبابچی، دانابوو، لەباتی هەرجووتە کەوشێک نانێک ودوو کەبابی وەرگرتبوو .ئێمە بەپێخواسی چووین وهەرکەسە پوولێ نان وکەبابی خۆمان داو کەوشەکانمان وەرگرتەوە.

نەخوشدەچێتە لای دوکتۆر ودەڵێ.

ـ قوربان زگم دێشێ

ـ بۆ؟

ـ نانی سووتاوم خواردووە

دوکتۆر دەرمانی چاوئێشەی بۆدەنووسێ

ـ قوربان عەرزمکردی زگم دێشێ ئەوە دەرمانیچاوئێشەیە

ـ ئەگەر چاوئێشەت نەبا نانی سووتاوت نەدەخوارد

ڕەئیس:ئێوەبۆ دەرنگ هاتوونەوە.

حەسەن: قوربان لەخەو مابووم .لەخەونمدا بەقەتار سەفەرم دەکرد

ڕەئیس:باشەئەتۆبۆدەرنگ هاتوویەوە

حوسێن: قوربان منیش چووبووم حەسەن بەڕێ بکەم ئاخر هاوکارەودەچێتەسەفەر.

ـ دەمەوێ خێزانم تەڵاق بدەم؟

ـ بۆ؟ چ بووە؟

ـ کوڕە چووزانم ،مانگ و نیوێکە قسەم لەگەڵ ناکا.

کوڕە ماڵ وێران، نەکەی تەڵاقی بدەی ،ژنی واهەروەگیر ناکەوێ

ڕۆژێک ماموستای فێرگە دەرسی ئینساندۆستی فێری قوتابی دەکرد. ڕووی تێکردن وگوتی:

ـ کوڕینە! ئەگەر من نەخوشبکەوم ئێوە چ دەکەن؟

ـ هیچ! نایەینەوە مەدرەسە

# جەدوەل

تێبینی : لەپڕ کردنەوەی ئەم جەدوەلەدا هەموو ئوسوولی ڕێنووسی کوردی بەپێی ڕێنووسی هەڵبژێردراوی ئەم گۆوارە ڕەچاو کراوە جگە لەوەی نیشانەی (v) دانەنراوە . واتا ئەگەر بۆ وێنە وشەی ( شڕ، گوڵ، زۆر، شێر و .. ) ی تێدا بێ بە شکڵی ( شر، گول، زور، شیر و .. ) دەنووسرێ

١٥ ١٤ ١٣ ١٢ ١١ ١٠ ٩ ٨ ٧ ٦ ٥ ٤ ٣ ٢ ١

١- نووسەری بەناوبانگی کوردکە کتێبی "دوو مەسەلەکە" و "کوردو کوردستان"ی نووسیوە- دوو دڵــــی و دڕدۆنگی ٢- ئامرازی تەعەجوب ـــ بنۆس و هەگەر- پەڕیوە وبێ ماڵ و حاڵ - ژیر و زیرک ٣- مانگێکی ڕۆمی- تاوتێ - واش هەر زگە ٤- خۆشـــی و ئاوات- کەلاش بۆخۆی بکا تای نابێ ناوی پیتێکی ئەلف وبێ ٥- دنمداوە موویە وتامی کەکرە - فەڕش وبــەڕە و لاکێش و جەواڵ و ....پێدەکرێ-کەوشـــی یەکسم ٦- زار و دەف - ئەمەش لەقەند دەگیرێ - زمانی خەڵکی ئەفغانستان- ٧- یارمەتی - کاس وگێژ - خۆر ٨- لــە ئاودا نوقم بووە - ئەز - کەوە بەڵام ناخوێنێ ٩- خاوەنی کتێبی "ئیلیاد" و "ئۆدیسە" - بانی وەتاغ لەژوورەوە ١٠- شە - لێ وەشاوەیی - لەقەبـــی شاعیرێکی بەناوبانگی کورد کە ناوی ئەحمەدە و لە شیعرگوتندا ڕێـــڕەوی فەقێ تەیرانە ١١- بەشێک لە گۆرانی- زۆرخۆر وادەبێ - گزینگ و تیرێژ ١٢- بەندی مۆرەی پشت- شارێکی نێوان کرماشان و هەورامان - حەرفی ئیزافە ١٣- شاعیری "تریفەی هەڵبەست". "دەشتی پڕپیتی نەغەدە ١٤- کەل وپەل - نەوعە سزایەک - شتێکـــی لیچق بێ ١٥- شارێکی کوردستانە و بە سووتاو" و "وێران" ناوبانگی دەرکردووە ـــ قانگە لاشک و هەژگەڵ .

١-شاعیری هێژاوو مەزنی کورد کە لە لەهجەی شیمالی شیعری گوتووە ،لەشوێنەوارە- کانی ئەم شاعیرە " نەوبەهار" ، "عەقیدا کوردی" ، " یـــوسـف و زولەیخایە" و... - ڕتووبەت ٢- مەڵبەندێکی پان و بەرین و خۆش ئاوو هەوای کوردستانی جەنووب- دژی خاو ٣- بەمانای تەرازوویە و بورجێکی فەلەکی یە - قەفەس وقەوەز ـــ میوەیەکە ٤- ژمارەیەکی بەراوەژوو - ڕەشکە - تکا و پارانەوە ٥- شمشاڵ وبلوێر ـــ وڵاتێکی ئەمریکایی یە، زمانی ئیسپانیایی یە وپێتە ختەگەی "سن دمنینـــگ"ە ٦- وەرزیشگایەکی قەدیمی یە - بیرەوەری - ئی ئازایان بەرزە ٧- نیوە پەلە - مرخ و ئیستعداد ٨- لە وێرانە دەخوێنێ - بەرامە - زینەتی برۆ- ٩- دوو جـــار بتێـــک ـــ مەقالە - باوەرو ئیعتیماد ١٠- هەڵکەوتە و زانا - چۆمی گەورە - خۆش وبەجێ ١١ ـــ گۆچ - دایک منداڵ وا گاس دەکا- ١٢- دیلان و هەڵپەڕکێ - ئاخاوتنی دوو کــەس ١٣ - ئیلیکی کورد نیشتەجێی تورکیا - ناوەندی ئوستانی کوردستان ١٤- ناوی پێغەمبەرێکە ( د.خ ) - شنەبای فێنک و بلاوێنی بەهار - توند نیە ١٥- بەیتێکی فۆلکلۆری کوردی یە و شینی جووتە خوشکانە بۆ جووتە برایان ...

لەنێو ئەو کەسانەیدا کە پڕکراوەی ئەم ژمارەی سروەمان بۆ بنێرن، یەک کەس بەپێـــی پشک بەبەرەندە دەناسرێ . بەمەرجێک ئەم خاڵانەی خواروو لەبەر چاو بگرێ :

١- جەدوەلەکە بە خەتێکی خۆش بنووسری وابێ پیتەکان بێنەخوێندنەوە .

٢- ئەسڵی جەدوەلەکەمان بۆ بنێرێ لە کاغەزی دیکەدا بەشداری نادرێ .

٣- لانی زۆر پازدە ڕۆژ پاش دەرچوونی گۆوار پڕکراوەی جەدوەلەکەی ناردبێ .

٤- پڕکراوەی جەدوەلەکە هەڵەی تێدا نەبێ .

جایزەی پڕکردنەوەی جەدوەل ساڵێک ئابوونمانی گۆواری سروەیە

# شمشاڵ

ح. ڕەشیدی زەرزا

شمشاڵێک بووم بەڕێز و ناز
لەگەڵ شوان و بێری هاوراز
شوانە پەنجەی لێ دەبزاوتم
بیری بێری پێ دەنگاوتم
بەلاّمسوورا ،گەردون گەڕی
شوانەی منیش شەرتی پەڕی
ڕووی خۆشی وگەشیم لێ تارا
لێم نەدیو بوو بووک و تارا
نوقمم لەنێو گەردالێ تۆز
تان وپۆم لێ بووە ئالۆز
کەوتووم لە سووچی هەرزالێ
کەس هەوایەکم پێ نالێ
هاوار لە داری دنیایە
هاوارێکم لەبەر نایە

ئەتۆ بەشقی خودای شوانە
تێرا مێنە لەم زۆزانە
چیمەن و مێرگ و گولزاری
کەند و لەند و بەرپەساری
قەڵپەزەی ئاو لەئاوهەڵدێر
کانی و ئاوی بە خێرو بێر
زەوی سەرانسەر خەملاّوە
دونیا خۆی لە گولێ داوە
هەور گشت گەواڵ گەواڵن
بە تەشقی ئاسماندا زاڵن
زەوی جلکی نوێی پۆشیوە
گوڵ عەتری ڕووی دابەشیوە
وا تێک چرژاوە گیا و گۆڵ
لێک ناکرێتەوە شێوو دۆڵ
هەڵپەرکێ و زەنا زەنایە
گۆوەندە ، بەزمە ، هەڵلایە

دنیا بە شنە دەشنێتەوە
تۆش منت وەبیر بێتەوە
هەڵم گرە تێمتووڕێنە
دیلانم پێ هەڵسووڕێنە
بۆ سەیرانی دیمەنی جوان
هەستی خەوتووم بێنێتە ژوان
کەپر وهۆبە و چیغ و چادر
ئالێ گۆنا ، ڕەنگی ئاگر
وەجۆش و خرۆشم بێنن
ڕازی دڵم بدرکێنن
کاکە شوانە لەمنت کەوێ
هەر سووکە ئاورێکم دەوێ
تاکەی لێم داخرێ دەروو
ببەسترێن زار و گەروو
ئاخر من وبێ ئاودەنگی ؟
وەرزی بەهار ودڵتەنگی ؟
بەسە دەردم زۆر چێشتووە
فرمێسکی ئاڵم ڕشتووە
ڕابردووی تۆ و شەنگەبێری
چەندین ترشی و تاڵی وسوێری
تۆماری نێو دڵی منە
بەو ئێشە جەرگم کون کونە
تاکەی بێدەنگی ڕەچاو کەم
تێمتووڕێنە دڵ پاراو کەم
ئەوەی دەنگی لەبەر نایە
دیلی دەستی ڕەشەبایە
بمبەوە ئەو چڕ و لێڕە
قامکم بەسەردا بگێڕە
بەوەی نیە بەژەنگارم
وەک پێشوو دڵ برینداره
هەر شمشاڵەکەی جارانم
خەمڕەوێنی دڵدارانم

ئەم شیعرە ناڵەی کۆنە شمشاڵێکە کە زستان لە سووچی هەرزاڵ ماوەتەوە وئێستا وەختی بژوێنی وڵاتداوا لە شوانەکەی دەکا لەبەر پشتێندی ڕابکاتەوە و گەڕی دیلان و گۆوەندی پێ بگێڕێ .

